## پێشەکی

ساڵی ١٩٩٦ کاتێک ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان بووم بەباشم زانی تیشک بخەمەسەر ژیاننامەی زانستیو کارگێڕیی مامۆستایانی زانکۆکانی هەرێمی کوردستان بەمەبەستی ناساندنی ئەم نوخبەیە بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و هەندەران چونکە مانەوەو خۆراگرتنی مامۆستایانی زانکۆ لە بواری خزمەتکردندا و بەشدار بوونیان لەخۆشیو ناخۆشی گەلەکەمان بە تایبەتی لەو بارودۆخەی کوردستانی پاتنیەری لە سەرووی هەموویانەوە شەڕی ناوخۆو گەمارۆی ئابووری هەڵبەتە ئەمە نیشانەی وەفاداری ئەم توێژەمان بۆ بەدیار دەخات ئەمەو سەرەڕای ئەوەی ئەم بەڕێزانە گرینگترین دەزگا لە دەزگاکانی کۆمەڵگای شارستانی بەڕێوە دەبەن کە دەزگای ڕۆشنبیرییە .

بۆئەم مەبەستە گۆشەیەکمان بەناوی ( سەکۆی زانکۆ ) کردەوە یەکەم زنجیرەی لە ژمارە ( ٣٣ ) ی ڕۆژی دووشەمە ڕێکەوتی ١٨/١١/١٩٩٦ بڵاوکرایەوەو دوازنجیرەشی لە ژمارە ( ١٤٨ ) ی ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ١٩/٢/١٩٩٨ بڵاوکرایەوەو تێکڕا ( ٤٠ ) زنجیرە بوون .

شایەنی ئاماژە بۆکردنە ، سەرەتا ویستم ژیاننامەکان بەپێی پلەی زانستیو پلەکی مامۆستاکان بێت بەڵام لەبەر سەرقاڵییان هەندێک لەو مامۆستایانە نەیانتوانی هاوکاریم بکەن بۆ پێکانی ئامانجەکە بۆیە ناچار بووم ڕوونکردنەوەیەک بنووسم و تیایدا ئەوە ڕوون بکەمەوە کە بڵاوکردنەوەی ژیاننامەی زانستی ئەم بەڕێزانە بەپێی ڕێکەوت و هەڵکەوتە نەک پلەی زانستیو کارگێڕی .

بەهەرحاڵ ، کوردستانی ئێمە لە زاناو پسپۆرو شارەزاو ڕۆشنبیران دەوڵەمەندە بۆیە ئەمەی لەبەردەستە مشتێکە لە خەرواریو هیواداریـن لە ئایندەدا بتوانین درێژە بە پرۆژەکەمان بدەین و زۆرترین بڕی زانیاریی لەسەر مامۆستای زانکۆکانی کوردستان لە ڕێبەرێکدا بڵاوبکەینەوە .

هەروەها سەبارەت بە زانیاریەکان ، هەروەکو لەپێشەوە ئاماژەمان پێکرد ، ئەم کارە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکەوتی ١٨/١١/١٩٩٦ تاکو ١٩/٢/١٩٩٨ بۆیە دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەندێک لەو بەڕێزانە دوای ئەم ماوەیە گۆڕانکاریی بەسەر ژیاننامەیان دا هاتووە ، تەنانەت هەندێکیان گیانی پاکیان بەخاک سپاردووەو چوونەتە ڕیزی نەمران لەوانە خوالێخۆشبوو پ.د. سەرتیپ فەتاح ئاغا کاکەیی، پ.د. عبدالحمید یعقوب جبرائیل ، د. أکرم احمد البرزنجی .

دانەر

هەولێر ٨ / ٢ / ٢٠٠١

...یەتیی کوردستان
ژمارە (٣٣) ـ دووشەممە ١٩٩٦/١١/١٨ ـ ٢٦٩٦ی کوردی

# سەکۆی زانکۆ

ئامادەکردنی: کەمال سەعدی



د. عبدالرحمن رحیم

چین و توێژی مامۆستایانی زانکۆ بەشێکی سەرەکی و هەرە دیاری گشت کۆمەڵگایەکن. کۆمەڵگای کوردەواریش وەکو کۆمەڵگاکانی تری گەلان هەر لەو ڕۆژەوەی بەرەو شارستانیەت هەنگاوی ناوە پلەو پای یەکێ دیاری بۆ ڕۆڵی ئەم چین و توێژە لەبەرەو پێشەوە بردنی ڕەوڕەوەی زانست و زانیاری لەکوردستان داناوە، چونکە ئەم چینە ڕوشنبیرە ئەکادیمیانە هەردەم لەخەبات و تێکۆشانی زانستی دابوونە بۆ ڕزگارکردنی گەل لەنەزانین و دواکەوتن.

بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەگەر بەراوردی کۆمەڵگای خۆمان لەگەڵ هی گەلانی تری دەوروبەر لەم کات و ساتەدا بکەین ڕەنگ بێت ئەم بارودۆخە نائاساییەی کەلەم سێ ساڵەی دواییدا کوردستانی گرتوتەوە مافی ئەوەمان پێ بدات کەناو لەم مامۆستا بەڕێزانە بنێین گیان لەسەر دەستان. چونکە ئەم بەڕێزانە زۆر بوێرانەو چاونەترسانە لەڕۆژانی شەڕی ناوخۆ کەتۆپ بەتۆپ.

دەکەوتەوتەوەو گوللە بەگوللە دەکەوت بەردەوام بوون لەسەر دەوام کردنی خۆیانو وەکو مەشخەڵێکیش بۆ قوتابیان سووتاونو شەوی تاریکو ئەنگوستە چاویان بەزانستو زانیاریەیە بەنرخەکانیان رووناک کردۆتەوە.

ئەوەی شایەنی باسە، چاوپێکەوتنو لەسەر نووسینی نووسەرانو رۆشنبیرانو هونەرمەندان لەووڵاتی ئێمەدا بۆتە شتێکی باو، کەچی تاکو ئێستا بەو رادەیە بیر لەچاوپێکەوتنی پسپۆرانی بواری زانکۆ نەکراوەتەوە بۆیە دەیان زانا وەکو سەربازی نەناسراو کەلەم بوارەدا کاردەکەن لەنێوانماندا لەقوتابیەکانیان بترازێ هەر بەنەناسراوی ماونەتەوە.

بۆیە بەپێویستم زانی لەم گۆشەیەدلو لەژێر ناوی «سەکۆی زانکۆ» هەر جارەی ژیان نامەی زانستی ی مامۆستایەکی زانکۆ لەزانکۆکەکانی کوردستان بۆ خوێنەرانی رۆژنامەی هەرێمی کوردستان بخەمەروو بەمەبەستی ئاشنابوونو پێزانینی هەوڵو تەقەلای ئەم کەڵەمێردانە.

مامۆستای ئەم ژمارەیەمان پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر عبدالرحمن رحیم عبداللەیە کەدامەزرێنەری کۆلیژی یاساو رامیاریەیە لەزانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێرو یەکەمین راگری بووە. بێ فیزیو ساکاریو رێکو پێکی خۆ پرچەك کردن بەزانستی نوێو بەسەر کردنەوەی بڵاوکراوەی نوێو بەخشندەی زانستی لەرواڵەتە هەرە دیارەکانی ئەم مامۆستا بەرێزەیە. ئەمەی خوارەوەش بەشێکە لەژیاننامەی زانستیو کارگێری ی.

• بۆ یەکەم جار لەبەرواری ١٩٦٨/١١/١٤ بەبروانامەی بەکالۆریۆسی یاسا لەزانکۆی سلێمانی دامەزراوە.

• لەساڵی ١٩٧٤ بەزەمالە رەوانەی رۆمانیا کراوەو دکتۆرای لەیاسای گشتی ی بەشی کارگێری ی وەرگرتووە.

* پێش ئەوەی دەست بەوانە ووتنەوە بكات گەلێك فەرمانی بینیوە هەر بۆیە لەیاریدەدەری تێبینەوە تا دەگاتە بەرێوەبەری خۆیەتی پێ سپێردراوەو لەرێكەوتی ١٩٧٩/٢/١٤ بۆ یەكەمین جار دەستی بەوانە ووتنەوە لەزانكۆ كردووە.

* لەساڵی ١٩٨١ لەلایەن حكومەتەوە رەوانەی جەزایر كراوەو لەوێ ولەی «الادارة العامة»ی بەقوتابیانی، ماجستیر ووتۆتەوە.

* لەساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ دەستەیەك مامۆستا كۆلیژی یاسای لەزانكۆی سەلاحەدین دامەزراندووەو بۆتە راگری كۆلیژەكەو بۆ پێنج ساڵ بەراگری تیای ماوەتەوە.

* لەزۆربەی لیژنەكانی بەرزكردنەوەی مووچەو پلە لەزانكۆی سەلاحەدین ئەندام بووە سەرەرای لیژنەكانی تری كاروباری رێكخستنو كارگێری ی.

* لەرێكەوتی ١٩٨٨/٩/١٩ بۆ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەر بەرز كراوەتەوە.

* دەرس بەقوتابیانی خوێندنی باڵا دەڵێتەوەو تاكو ئێستا سەرپەرشتی لەسەر دوو ماستەرنامە لەبواری یاسادا كردووە.

یەكەمیان بەناوی «حق الملكية الادبية والفنية في القانون العراقي والمقارن» وە دووەمیان بەناوی «اساس مسؤولية الادارة وقواعدها».

هەروەها سەرۆكایەتی لیژنەی ووتوێژی ئەم ماستەرنامانەی خوارەوە كردووە:

١ـ النظرية العامة لجريمة الامتناع.

٢ـ علاقة السببية في القانون الجنائي.

٣ـ عقد النزول في الفندق.

* ئەم نووسراوو بڵاوكراوە زانستیانەی خوارەوەی هەیە:

١ـ نامیلكەیەك بەناوی «دلیل الخدمة والملاك والانضباط» لەساڵی ١٩٧٢ بەچاپ گەیاندراوە.

٢ـ نامیلكەیەك بەناوی «الادارة وممارسة المهنة الهندسية» لەساڵی ١٩٨٠ بەهاوبەشی لەگەڵ دكتۆر سەعدی بەرزنجی بەچاپ گەیاندووە.

٣ـ سلطة المحكمة في تعديل الشرط الجزائي بەهاوبەشی لەگەڵ دكتۆر فاضل زەهاوی.

٤ـ موقف الفقه والقضاء من سلطة الادارة في تعديل عقودها الادارية.

٥ـ وقفات على المشروعية من حيث مفهومها وتمييزها من الشرعية ومصادرها.

٦ـ نظرات في النظام القانوني لانضباط موظفي الدولة في العراق بەهاوبەشی لەگەڵ دكتۆر سەعدی بەرزنجی.

٧ـ مسؤولية الادارة على اساس الخطأ.

٨ـ اللامركزية الادارية واللامركزية الفدرالية واوجه المقارنة بينهما.

٩ـ التكييف القانوني للرابطة مابين المؤجر والمستأجر في ضوء قانون ايجار العقار رقم ٨٧ لسنة ١٩٧٩ بەهاوبەشی لەگەڵ مامۆستا همزه خسرو.

١٠ـ تكوين عقد الايجار في ضوء قانون ايجار العقار رقم ٨٧ لسنة ١٩٧٩ المعدل بەهاوبەشی لەگەڵ مامۆستا همزه خسرو.

١١ـ الترابط العضوي مابين حقوق الانسان والديمقراطية.

## سەکۆی زانکۆ



# پرۆفیسۆر د. سەعدی بەرزنجی

هەرچەندە پرۆفیسۆر د. سەعدی ئیسماعیل بەرزنجی لەوە بەرزترە ئێمە لەگۆشەیەکی وادا بەچەند ڕستەیەك باسی بکەین بەڵام سەرەڕای ئەوەش بەلامانەوە شتێکی خراپ نییە کەتیشك بخەینە سەر هەندێك لایەنی شاراوە لەژیانی ئەم هێژایەو بەلای کەمییەوە بەو خوێنەرانەی بناسین کەتاکو ئێستا بەتەواوەتی نایناسن.

پرۆفیسۆری بەڕێز یەکێکە لەپرۆفیسۆرە هەرە دیارەکانی یاسای شارستانی لەعێراقدا بەگشتیو کوردستان بەتایبەتی بۆیە جارێکیان هاوڕێیەکی پارێزەرم بۆی گێڕامەوە ووتی:(قوتابییەك لەزانکۆی سەلاحەدین گوێزرابۆوە بۆ کۆلیژەکەمان کۆلیژی یاسا لەزانکۆی موسڵ. جارێکیان لەوانەی یاسای شارستانی دەستی هەڵبڕیو ووتی ئەم بابەتە تێنەگیشتوومە؟ مامۆستای وانەش پێی ووت ئەگەر تۆ لەدکتۆر سەعدی تێنەگەیشتبی ئەوا هەر لەئێستاوە پێت ڕادەگەیەنم کەماف پەروەرێکی فاشل دەبێت لەژیاندا چونکە مامۆستای بەڕێز مامۆستای ئێمەیە). هەروەها پرۆفیسۆری فەرەنسایی بەناوبانگ مازو لەنوێ ترین بەرهەمی چاپکراویدا ئاماژەی بەدکتۆرانامەکەی دکتۆری هێژا کردووە.

شایەنی باسە، پرۆفیسۆر بەرزنجی یەکەم پسپۆرە لەبواری یاسادا کەبۆ یەکەم جار دوو کتێبی ئەکادیمی ی بەزمانی کوردی بەچاپ گەیاندبێ سەرەڕای بەشداری کردنی وەك ڕاوێژکارێك لەلیژنەی گۆڕینی زاراوە یاسایی یە عەرەبی یەکانی بواری دادگا بۆ زمانی کوردی ئەمەو بەشداری بوونی لەدانانی زۆربەی یاساکانی هەرێمی کوردستان لەسەرووی هەموویانەوە یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمان.

هەروەها ڕۆڵی سەرەکی بینیوە لەکردنەوەی خوێندنی باڵا بۆ یەکەم جار لەکۆلیژی یاساو ڕامیاری لەزانکۆی سەلاحەدین ــ هەولێرو خوێندنی زمانی فەرەنسی لەپاڵ زمانی ئینگلیزی لەم بەشەدا.

**ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەژیانی زانستی و کارگێری پرۆفیسۆری بەڕێز:**

• د. سعدی اسماعیل عبدالکریم بەرزنجی لەساڵی ١٩٤١ لەدایك بووە.

•پلە زانستی یەکەی پرۆفیسۆرەو ڕاگری کۆلیژی یاساو ڕامیاری یە لەزانکۆی سەلاحەدینو ڕاوێژکاری یاسایی هێزا مەسعود بارزانی یە.

**• ئەم بڕوانامانەی خوارەوەی هەیە:ــ**

ــ بەکالۆریوسی یاسا لەزانکۆی بەغدا ــ ساڵی ١٩٦٦.

ــ ماجستیر لەیاسای تایبەتیدا لەزانکۆی بەغدا ــ ساڵی ١٩٧٢.

ــ دکتۆرای دەوڵەت لەیاسای شارستانیدا لەزانکۆی گرنوبل لەفەرەنسا ــ ساڵی ١٩٧٨.

• ئەمەی خوارەوە ناونیشانی ماستەرنامەو دکتۆرانامەکەیەتی:

ــ الاشتراط لمصلحة الغير في الفقه الغربي والفقه الاسلامي.

ــ شروط الاعضاء من المسؤولية العقدية في القانون الفرنسي والقانون العراقي.

**• ئەم فەرمانانەی خوارەوەی بینیوە:**

ــ یاریدەدەری تێبینو سەرۆکی تێبین لەنێوان ساڵانی ١٩٦٦ــ١٩٧٢.

ــ موعیدو مامۆستای یاریدەدەرو بەڕێوەبەری بەشی مافو بەڕێوەبەری کارگێڕی لەنێوان ساڵانی ١٩٧٢ــ١٩٧٥ لەزانکۆی سولەیمانی.

ـ مامۆستای یاسای بازرگانی لەکۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابووری لەنێوان سالانی ١٩٧٨ـ١٩٨٣.
ـ ئەمینداری گشتی کاروباری ئابووری و دارایی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان بەپلەی وەزیر لەنێوان سالانی ١٩٨٣ـ١٩٨٦.
ـ پرۆفیسۆری یاریدەدەر لەسالی ١٩٨٨.
ـ پرۆفیسۆر لەڕێکەوتی ١٩٩٤/٦/١٥.

**• دەیان لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی ی لەبواری یاسادا هەیە ئەمەی خوارەوە ناوی بەشێکە لەوانە:**

ـ بحث موجز عن اقسام القانون وتعريفه ١٩٨٢.
ـ عورف ـ ١٩٨٤.
ـ مجال تطبيق شروط الاعضاء من المسؤولية التعاقدية في القانون الفرنسي في ضوء المركز الاقتصادية العقد ـ ١٩٩٠.
ـ شرط التحكم في مقاولات اعمال الهندسية.
ـ المشاكل القانونية الناجمه عن تكنولوجيا الانجاب الجديدة.
ـ ملاحظات حول مشروع الحكومة العراقية للحكم الذاتي، تموز/١٩٩١.
ـ قاعدة لايعذر احد لجهله بالقانون بين الافتراض والواقع بەهاوبەشی لەگەڵ د. عبدالستار رشيد.
ـ فصل السلطات في النظام الديمقراطي ـ پێشکەشی کۆنگرەی دوارۆژی دەستووری عێراقی لەلەندەن لەسالی ١٩٩٥ کراوە بەزمانی ئینگلیزی.
ـ گۆڕینی پێشەکی (Liscot) لەڕۆمانی (مەمی ئالان) لەفەرەنسی یەوە بۆ عەرەبی.
ـ مشكلة الاراضي الزراعية في كوردستان.
ـ نظرات النظام القانوني لانضباط موظفي الدولة العراق بەهاوبەشی لەگەڵ د. عبدالرحمن رحيم.
ـ گۆڕینی فەسلی (دایك کورد) لەکتێبەکەی خاتوو میتران بەناونیشانی (مدام ميتران بصراحة تامة). لەفەرەنسی بۆ عەرەبی.
• ئەم کتێبە بڵاوکراوانەی خوارەوەی هەیە:
ـ التعليق على القرار القضائي في مواضيع القانون الخاص لەفەرەنسی یەوە وەرگێڕاوە بۆ عەرەبی ـ١٩٨٢.

ـ تیوری ی گشتی ی یاسا ـ١٩٨٩.

ـ تیوری ی گشتی ماف ـ١٩٨٩.

ـ الاشتراط لمصلحة الغير في الفقة الغربي والفقة الاسلامي ـ١٩٧٥.

ـ شروط الاعضاء من المسؤولية العقدية في القانون الفرنسي والقانون العراقي ـ فرنسا بەزمانی فەرەنسی ١٩٧٨.

• دەیان نووسین و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆری بەزمانی کوردی و عەرەبی و فەرەنسی لە رۆژنامەوگۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە. هەروەها بەیاننامەی یەکێتی ی فیدرالی کوردستانی دارشتووە کە لەلایەن پەرلەمان لە ١٩٩٢/١٠/٤ دەرچووە.

• بەشداری دەیان لیژنەی زانستی و کارگێری ی کردووە لەوانە:

ـ سەرۆکی لیژنەی زانستی ی.

ـ ئەندامی لیژنەی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی ماموستایانی زانکۆ.

ـ سەرۆکی لیژنەی ئینزباتی ماموستایانی زانکۆ.

• بەشداری ئەم کۆنگرانەی خوارەوەی کردووە:

ـ کۆنگرەی زانستی ی یەکەم ـ وەزارەتی ئاوەدان کردنەوەو نیشتەجێ بوون ١٩٩٠.

ـ کۆنگرەی زانستی ی یەکەم ـ زانکۆی سەلاحەدین ـ١٩٨٧.

ـ کۆنگرەی زانستی ی دووەم ـ زانکۆی سەلاحەدین ـ ١٩٩٣.

ـ وەرزی رۆشنبیری ی ـ کولیژی یاساو رامیاری ـ ١٩٩٤.

ـ کۆنگرەی زانکۆکانی عێراقی . ١٩٨٧.

ـ کۆنگرەی یەکەمی (الرعاية العلمية) ـ ١٩٨٨.

ـ کۆنگرەی دوارۆژی دەستووری ی عێراقی لەزانکۆی لەندەن ـ١٩٩٥.

ـ کۆنگرەی زانکۆکانی فەرەنسا سالی ١٩٩٥ لەپاریس.

**• سەرپەرشتی چەند نامەیەکی ماجستیرو بەشداری وەکو ئەندام لەلیژنەی موناقەشەی چەند نامەیەکی تردا کردوە.**

# سەکۆی زانکۆ

## دکتۆر مارف خەزنەدار



گەشت کردن بەنێو گوڵزاری ژیاننامەی زانستیی پرۆفیسۆر دکتۆر مارف خەزنەدار شتێکی ئاسان نییە، چونکە هەر ساڵێکی تەمەنی ئەم زاتە پڕە لەدەیان شاکارو بەرهەمی بەنرخ ڕەنگ بێت لەگۆشەیەکی وادا جێگای نەبێتەوە، بەڵکو پێویست بەلێکۆڵینەوەو توێژینەوەی قوڵترو چڕوپڕتر دەکات بۆیە ئێمە ناچارین لەم حاڵەتەدا ئیکتیفا بەخستنەڕووی بەشێك لەو ژیاننامە زانستییە پرشنگدارە بکەین.

- ناوی تەواوی معروف عبدالقادر معروف خەزنەدارە.
- لە ١٩٣٠/١١/١ لەشاری هەولێر لەدایك بووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لەشاری هەولێرو کەرکوك تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٥٧ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەزمان و ئەدەبی عەرەبی لەکۆلێژی زانیاری و ئادابی بەغدا وەرگرتووە.
- لەساڵی ١٩٦٠ لەلایەن وەزارەتی مەعاریفەوە ڕەوانەی یەکێتی سۆڤێتی پێشوو کراوەو لەئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی لەشاری لینینگراد دەستی بەخوێندنی دکتۆرا کردووە.
- لەساڵی ١٩٦٢ بڕوانامەی دکتۆرای لەنامەی «مێژووی ئەدەبی کوردی هاوچەرخ» وەرگرتووە.

ئەم نامەیە لەساڵی ۱۹٦۷ بەشێوەی کتێب لەلایەن دەزگای ئەکادیمیا بۆ بڵاوکردنەوە لەمۆسکۆ بڵاوکراوەتەوە. یەکەم کتێبە لەبارەی ئەدەبی کوردی بەزمانی ئەورووپی چاپ بکرێ. هەر ئەم کتێبە لەساڵی ۱۹۹۳ لەلایەن دکتۆر عبدالمجید شێخۆ وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیو لەسوریا چاپ کراوە.

- لەساڵی ۱۹٦۲ تاکو ۱۹٦۸ وەکو توێژەرێك (باحث) لەئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی لەلینینگراد کاری کردووە، لەو ماوەیەدا لەگەڵ چەند کەسێکی تر بۆ ئامادەکردنی فەرهەنگێکی کوردی ـ روسی کاری کردووە.

ئەوەی شایەنی باسە، ئەو فەرهەنگە لەساڵی ۱۹۸۳ بڵاوکرایەوە. هەروەها گەلێك نووسینو لێکۆڵینەوەی لەبارەی هەردوو شاعیری کورد نالیو عەبدوڵا بەگی مصباح الدیوان پێشکەش کردووە، هەروەها لەگەلێك دەستنووسی کوردی لەبارەی زمانو ئەدەبەوە کۆڵیەوەتەوە، سەرجەم بەرهەمەکانیش لەو ماوەیەدا ئەنجامی دابوون لەبەغدا بڵاوکرانەوە.

هەر لەهەمان کاتی دەست بەکاربوونی لەئامۆژگای ناوبراو، هەڵساوە بەووتنەوەی وانەی کوردیو عەرەبی بەقوتابیانی خوێندنی باڵا لەو ئامۆژگایە، هەروەها بەشداری لەکۆنگرەی جیهانیی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی گەلانی رۆژهەڵات کردووەو لەبەهاری ساڵی ۱۹٦۷ موحازەرەیەکی لەبارەی «رۆمانتیکییەت لەئەدەبی کوردی» پێشکەش کردووە.

بابەتی موحازەرەکە کراوە بەکتێبو بەزمانی رووسی لەزنجیرە کتێبەکانی کۆنگرە لەساڵی ۱۹٦۸ لەمۆسکۆ بڵاوکراوەتەوە.

- لەچوارچێوەی یەکێتیی سۆڤیێتیی پێشو لەپێنج کۆنگرەی ئەقلیمی بەشداری کردووەو تیایاندا موحازەرەی لەبارەی ئەدەبی کوردیو عەرەبی خوێندۆتەوە، لەدواییشدا سەرجەم موحازەرەکان لەلایەن کۆنگرەوە وەکو کتێب بڵاوکرانەتەوە.
- لەساڵی ۱۹٦۸ تاکو ۱۹۸۱ لەکۆلیژی ئادابی بەغدا بەشی زمانی کوردی ئەندامی دەستەی وانەبێژان بووەو وانەی

ئەدەب و رەخنەی ووتۆتەوە.

• لەساڵی ١٩٧٣ تاکو ١٩٨١ سەرۆکی بەشی کوردی ئەو کۆلێژە بووە.
• لە ١٩٦٩/١/١ ناوونیشانی مامۆستا بووە.
• لە ١٩٧٣/١/١ بۆ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەر بەرزکراوەتەوە.
• لە ١٩٧٩/١٢/١٨ بۆ پلەی پرۆفیسۆر بەرزکراوەتەوە.
• لەساڵی ١٩٩٢ لەلایەن ئەنجومەنی خوێندنی باڵا پاڵێوراوە بۆ پلەی مامۆستای یەکەم لەزانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر.
• لەساڵی ١٩٧٦/١٩٧٧ بەشی زمانی کوردی لەکۆلێژی پەروەردەی زانکۆی بەغدا کرێتەوەو بۆتە سەرۆکی بەشەکە.
• لەساڵی ١٩٨٢ تاکو ١٩٨٨ لەزانکۆی عەنابە لەجەزائیر بۆتە مامۆستای ئەدەبی جیهانی (ئەورووپی)و ئەدەبی بەراوورد.
• لەساڵی ١٩٨٨ تاکو ئێستا مامۆستای ئەدەبی کوردیو ئەدەبی بەراوورده لەزانکۆی سەلاحەدین.
• بەدرێژایی خزمەتی لەئامۆژگای رۆژهەلاتناسی لەلینێنگراد، کۆلێژی ئاداب لەزانکۆی بەغدا، ئامۆژگای زمانو ئەدەبی عەرەبی لەزانکۆی عەنابە لەجەزائیر، کۆلێژی پەروەردە لەزانکۆی بەغدا، کۆلێژی ئاداب لەزانکۆی سلێمانی، کۆلێژی شرطە لەبەغدا، زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر ئەم وانانەی خوارەوەی ووتۆتەوە: مێژووی ئەدەب، رەخنەی ئەدەبی، ئەدەبی جیهانی ی (ئەورووپی)، تیوری ی ئەدەب، مێژووی دراساتی کوردی، بەرنامەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ساغ کردنەوەی دەستنووسی، رۆژهەلاتناسی (الاستشراق)، زمانی کوردی، زمانی روسی.
• زمانی کوردیو عەرەبیو رووسی دەزانێتو لەگەڵ زمانی تورکیو فارسی ئاشنایەو زمانی ئینگلیزیو فەرەنسیش دەخوێنێتەوە.
• وەکو پەیامنێرو ئەندامی دەستەی نووسەرانو سکرتێری نووسینو سەرۆکی دەستەی نووسەران لەهەندێك رۆژنامەو گۆڤار کاری کردووە بەتایبەتی ئەوانەی کەبەزمانی کوردی یان عەرەبی دەردەچوون لەوانە:

رۆژنامەی هەولێر ١٩٥٠ـ١٩٥٢، گۆڤار «الصحيفة» بەغدا ١٩٥٣ـ١٩٥٤، رۆژنامەی «الرأي العام» بەغدا ١٩٥٥، گۆڤاری «الشفق» کەرکوک ١٩٥٨ـ١٩٥٩، گۆڤاری «الدفاتر الكردية» بەغدا ١٩٧٠، گۆڤاری «نووسەری کورد» بەغدا ـ١٩٧٢، گۆڤاری «شمس کردستان» بەغدا ١٩٧٢ـ١٩٧٥، گۆڤاری کۆلیژی ئاداب زانکۆی بەغدا ١٩٧٢ـ١٩٨١، گۆڤاری (الجامعة) زانکۆی عەنابەـ جەزائیر ١٩٨٤ـ١٩٨٨، گۆڤاری زانکۆ «العلوم الانسانية» زانکۆی سەلاحەدین ١٩٨٩، گۆڤاری کاروان ـ ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان ١٩٩٠ـ١٩٩١.

- ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی ی نووسەرانی کورد ١٩٧٠و کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی ١٩٧١ یە.
- لە جەزائیر سەرپەرشتی دوو نامەی دکتۆراو سێ ماستەرنامەی کردووە.
- لەزانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر سەرپەرشتی سێ نامەی دکتۆراو زیاتر لەپانزە ماستەرنامەی کردووە.
- زیاتر لەسەد پارچە نووسین و لێکۆڵینەوەی هەمەجۆری لەبوارەکانی زمان و ئەدەب و کەلتوور بەزمانی کوردی و عەرەبی و رووسی ی هەیە.
- ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەکتێبە بڵاوکراوەکانی:

١ـ کێش و سەروا لەشعری کوردیدا ـ بەغدا ١٩٦٢.
٢ـ مێژووی ئەدەبی کوردی هاوچەرخ ـ مۆسکۆ ١٩٦٧.
٣ـ هەمان کتێبی پێشوو بەزمانی عەرەبی لەساڵی ١٩٩٣ لەسوریا چاپ کراوەتەوە.
٤ـ لێکۆڵینەوە لەچیرۆکی کوردی و چەند نموونەیەکی چیرۆکی کوردی وەرگێردراو ـ مۆسکۆ ١٩٦٨.
٥ـ عەبدوڵا بەگی مصباح الديوان، ژیاننامەو دیوانی شعری بەغدا ١٩٧٠.
٦ـ زمان و ئەدەبی کوردی، کتێبی مەنهەجی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ـ بەغدا ١٩٧١.
٧ـ رێزمانی عەرەبی بەزمانی کوردی بەغدا ١٩٧١.
٨ـ دیوانی نالی ـ بەغدا ١٩٧٧.
٩ـ مخطوطات فريدة ومطبوعات نادرة ـ بەزمانی عەرەبی لەبەغدا لەساڵی ١٩٧٨ چاپ کراوە.
١٠ـ لەبارەی ئەدەبی کوردی یەوە بەغدا ١٩٨٤.
١١ـ اغانی کردستان، بەغدا ١٩٥٦.
١٢ـ بووکە شووشە، بەغدا ١٩٦٩.

١٣ـ ئەڵەمان کوردیو هەندێ چیرۆکی تر بەغدا ١٩٦٩.
١٤ـ ناڵی لەدەفتەری نەمریدا ـ بەغدا ١٩٨١.
• ئەم بەرهەمانەی خوارەوەی بۆ سەر زمانی کوردی یان عەرەبی وەرگێڕاوە:
١ـ الاکراد، ملاحظات وانطباعات ـ نووسینی فلادیمیر مینورسکی بەزمانی رووسی، پیتروغراد ١٩١٥ ـ بەغدا ساڵی ١٩٦٨ چاپ کراوە.
٢ـ تاریخ الدراسات الشرقیة في لیننگراد ١٩١٨ـ ١٩٦٨ لەزمانی رووسی بۆ سەر زمانی عەرەبی وەری گێڕاوە لەبەغدا ساڵی ١٩٨٠ چاپ کراوە.
٣ـ الرحالة الروسی في الشرق الاوسط، ب.م. دانتسیغ، لەزمانی رووسییەوە بۆ زمانی عەرەبی وەری گێڕاوەو لەبیروت لەساڵی ١٩٩٥، چاپ کراوە.
٤ـ پۆشکین گەشتێك بۆ ئەرزەرۆم لەسوید لەساڵی ١٩٩٥ چاپ کراوە.

**دوو تێبینی پێویست:**

١ـ ئەمەی سەرەوە بەشێکە لەژیاننامەی زانستیی و کارگێڕیی مامۆستای بەڕێز پرۆفیسۆر دکتۆر مارف خەزنەدار.
٢ـ دابەزینی ژیاننامەی زانستیی مامۆستایانی زانکۆ لەم گۆشەیەدا بەپێی پلەی زانستییەکەیان نیيە، بەڵکو بەپێی هەڵکەوت و ڕێکەوتە، چونکە هەندێك لەو مامۆستا بەڕێزانە سەرەڕای ئەوەی پلەی زانستییان بەرزە کەچی ژیاننامەکەیان ئامادە نییە وەیان هەر خۆیان حەز دەکەن بڵاوکردنەوەی ژیاننامەکەیان هەندێك دوابکەوێ.

## سەکۆی زانکۆ

# پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. سرتیپ فتاح ئاغا کاکەیی



دکتور سرتیپ، تاکە پسپۆرە لە عێراق دا لە بواری زانستی بایۆفیزیک دا، ئەو زانستەی کە بە بابەتێکی بنەڕەتی دادەندرێت لە گشت زانکۆکانی دونیا لەبەرئەوەی ئەم زانستە لە یەک کاتدا بایەخ بە زانیاریی فیزیک و بایۆلۆجی و کیمیا بە شێوەیەکی یەکسانی دەدات.

هەروەها دکتۆری بەڕێز لەبەر لێهاتوویی و کارامەیی گرنگی پسپۆڕیتی یەکەی وەکو ئەندامێک لە ڕێکخراوی یونسکۆ لە ئیتالیا وەرگیراوەو بۆ ئەم مەبەستە چەندین جار بانگێش کراوە بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەو کۆنگرەکانی ئەم ڕێکخراوەو چەندین کۆنگرەی تری جیهانی لەم بارەیەوەو لەسەر حسێبی خۆی ئامادەی هەندێکیان بووە.

هەروەها لە ڕووی دەستی نووسین و ڕۆژنامەگەریشەوە خۆ توانای نووسین و پسپۆڕێتی یەکەی هیچی کەمتر نی یە لە پسپۆڕێتی یە زانستی یەکەی.

دکتۆری بەڕێز خاوەنی بەهرەیەکی ئەدەبی و فەلسەفی دیارە لە بواری نووسین دا، لەم چەند ساڵانەی دوایی دا بەتایبەتی دوای ڕاپەڕین وەکو نووسەرێکی

کارامەو رۆژنامەنووسێکی بەتواناو ئازاد لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و رووبەری رۆژنامەکاندا بەدیارکەوت. نووسینەکانی سروشتێکی فەلسەفی و رەخنە ئامێزییان بەخۆوە گرتووەو دەست نیشانی دیاردە دزێوەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ی کۆمەڵگاکەمان دەکات و خاڵ دەخاتە سەر پێتەکان بەمەبەستی چارەسازی و نەهێشتنی ئەم دیاردە تاڵانە.

• لەساڵی ١٩٤٩ لەگوندی تۆبزاوەی سەر بەناحیەی داقووق، لەپارێزگای کەرکوك لەدایك بووە.

• لەتەمەنی چوار ساڵ و نیوی دا چۆتە بەر خوێندن و خوێندنی سەرەتایی لەگوندی تۆبزاوە لەو قوتابخانەیە تەواو کردووە کەفتاح ئاغای باوکی لەسەر حسێبی خۆی بۆ خەڵکی گوندەکە دروستی کردبوو.

• لەساڵی ١٩٧٩ بۆ یەکەم جار لەزانکۆی سلێمانی دامەزراوەو وانەی فیزیای پزیشکی ی لەکۆلیژی پزیشکی لەو زانکۆیە ووتۆتەوە. دوابەدوای ئەوەو تاکو ئێستا لەزانکۆی سەلاحەدین بەردەوامە لەوتنەی ئەم وانەیە.

• لەساڵی ١٩٧٩ بڕوانامەی دکتۆرای لەبایۆفیزیك لەزانکۆی لیدزی بەریتانی لەدکتۆرا نامەی:

Structural Studies of au O- Dichoro phény Choline Ether/ A binuclear Complex of Tungsten (V) and a Camplex of Beauvericin

وەرگرتووە.

• لەساڵی ١٩٨٤ بۆتە ئەندامی رێکخراوی یۆنسکۆ ــ مەڵبەندی نێودەوڵەتی بۆ فیزیکی نەزەری کەبەهێمای (ICTP) ناسراوە.

• سەرۆکی بەشی بایۆفیزیك و ژمێریاری یە لەکۆلیژی پزیشکی.

• تاکو ئێستا لەرێگای (التحفیز الکهربائي) چارەسەری زیاتر لە(٨٦) نەخۆشی ترسناکی کردووە کەلەسەر لێواری قاچ بڕینەوە بوونە.

• سەرپەرشتی زیاتر لەحەوت ماستەرنامەی پزیشکی کردووە.

• تاقیگایەکی بۆ تۆژینەوەی بایۆفیزك دروست

کردووه، سەرەرای هەموو کۆسپ و تەگەرەیەك.

• تاقیگەیەکی رێك وپێك و تەواوی خۆی هەیە.

• دەیان ووتارو لێکۆڵینەوەی بەزمانی عەرەبی لەتەلەفزیۆن و رۆژنامەکانی هەرێمی کوردستان بڵاوکردۆتەوە. ئەمەی خوارەوە ناوی هەندێك لەو بابەتانەیە:

١ـ إلى من يعشق العلم.

٢ـ الى اعزائي اساتذة الجامعة.

٣ـ الى من يهمه امر الجامعة مع التحيات.

٤ـ نحو انشاء اكاديمية علمية كوردية خلاقة.

٥ـ التعليم العالي لماذا وكيف.

٦ـ الدراسات العليا كيف يجب ان تكون.

٧ـ ماهو الانسان في الطبيعة.

٨ـ شرودينگر هذا العالم الذي مهد السبيل لاكتشافات بايولوجية هائلة.

• دەیان لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی بەزمانی ئینگلیزی هەیە.

ئەمەی خوارەوە ناونیشانی هەندێك لەو بابەتانەیە تی:

Biophysics gr...
address.

Papers published and presented :


1. Khalil, S. , Geddes, A.J. and Sheldrick, B.(1976), Cryst.Struct.Comm. 5,47.

2. Khalil, S., Sheldrick ,B., Soares,A.B. and Sykes,A.O.(1977). Inorganica Chemica Acta,25,L83.

3. Khalil , S , and Sheldrick , B. (1978), Acta.Cryst .B34,3751.

4. A presentation was made in the Fourth European Crystallographic Meeting, Oxford, (1977), Abstracts PII .82 ,571

5. Shaker , A.A. and Kakai, S.F.K., A comparative study on the effects of Amitriptyline And Glafenine In the treatment of chronic headache . ALRAZI, Medical Journal, Iraqi Society of Neurologists and psychiatrists Volume 8&9, P24-39 .(1985) .

(2)

6. Saleh J.S. , and Kakai , S.F. , Children Health in Erbil , Zanist-Gova Rawshanbere Nwe, In Kurdish, Baghdad, Iraq, No. 119, P 64-70 .(1988).

7. Kakai , S.F, , AL-Barwari ,S.S , and AL-Senawi , T.A., Effects of He Ne Laser Beam on Mechanical, Heat, Chemical and Superficial wound Zanco, The Scientific Journal of Salahaddin University, Arbil, Iraq Vol.4,No.1, P100-108 (1991).

8. Kakai , S.F, Mahmood, A.R. and Khalifa, J.S. , Effects of Radiation O The L-Tryptophan Absorption Spectrum, Zanco, The Scientific Journal o Salahaddin University, Arbil, Iraq, Vol.6, (1991).

9. Kakai S.F. ...

## سەکۆی زانکۆ

# پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. شکریە رسول



دکتۆرە شوکریە رەسول ئەو پسپۆرە لێهاتووەیە کە توانیویەتی بەتەنها بەشێکی زۆری ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە ئافرەتی کورد لەنێو زانکۆو گۆرەپانی زانستدا بەجێی هێشتووە.

خاوەنی هێزو توانایەکی لەبن نەهاتووی زەینییە بەردەوام لێرەو لەوێ نووسینەکانی ئەم مامۆستایەمان بەرچاو دەکەوێ. ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەژیاننامەی زانستی و کارگێڕیی دکتۆرەی بەرێز:

- ناوی شوکریە رەسوڵەو بەشەکراو ناسراوە.
- لەساڵی ١٩٥١ لەشاری سلێمانی لەدایک بووەو خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی هەر لەو شارەدا تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٦٧_١٩٦٨ لەزانکۆی بەغدا، کۆلێجی ئاداب بەشی کوردی وەرگیراوەو لەساڵی ١٩٧١_١٩٧٢ بەکالۆریوسی لە ئەدەب و زمانی کوردی وەرگرتووە.
- دوای تەواو کردنی خوێندنی کۆلێژی ئاداب لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ خوێندن نێردراوە بۆ یەکێتی سۆڤێتی پێشوو ولەساڵی ١٩٧٧ بڕوانامەی دکتۆرای لەفۆلکلۆری کوردیدا لەزانستگای رۆژهەلاتی وەرگرتووە.
- ساڵی ١٩٧٧ بۆ ماوەیەکی کورت لەکۆڕی زانیاری کورد لەبەغدا کاری کردووە.

• سالی ١٩٧٨ بۆ زانکۆی سلێمانی فەرمانگەی گوێزراوەتەوەو لەکۆلێژی ئاداب بووە بەمامۆستا.
• لەسالی ١٩٨٥ بەرزکرلوەتەوە بۆ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەر.

• لەسالی ١٩٨٢ تاوەکو ١٩٨٤ ئەرکی سەرۆکایەتی بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی لەزانکۆی سەلاحەددین پێ سپێردراوە.
• تاکو ئێستا سەرپەرشتی چەندین نامەی ماجستێری کردووە لە «ئەدەب، فۆلکلۆر، رۆژنامەگەری، ئەدەبی نوێی کوردی».
• بەشداری دەیان لێژنەی ووتوێژی خوێندنی بالاَ بۆ پلەی ماجستێرو دکتۆرای کردووە.

• لەناو رێکخراوو کۆمەلەکاندا ئەم پلانەی خوارەوەی بەهەلْبژاردن وەدەست هێناوە:

- جێگری سەرۆکی وەرگێرانی کوردستان.
- سەرۆکی لیژنەی ئامادەکردنی کۆمەلەی فۆلکلۆری کوردی.
- ئەندامی دەستەی بالاَی کۆمەلەی شەهیدانی کوردستان.
- ئەندامی دەستەی بالاَی سەرجەم رێکخراوە جەماوەری یەکان.
- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد.
• دەیان بەرهەمی ئەدەبی و رۆشنبیریی لەرۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردستان و عێراق دا بلاَوکردۆتەوەو بەچاپ گەیاندووە ئەمەی خوارەوە ناوونیشانی بەشێکە لەو بەرهەمانەی:
- کۆمەلە رازێك بۆ منالان - لەرووسی یەوە وەری گێراوە.
- داب و نەریتی کوردەکان - لەرووسی یەوە وەری گێراوە.
- ناوەرۆکی فیکری و ئەدەبی و پەندو قسەی نەستەقی کوردی - نامەی دکتۆراکەیەتی لەرووسی یەوە وەری گێراوە بۆ کوردی.

• سالی ۱۹۷۸ بۆ زانکۆی سلێمانی فەرمانگەی گوێزراوەتەوەو لەکۆلێژی ئاداب بووە بەمامۆستا.
• لەساڵی ۱۹۸۵ بەرزکرلوەتەوە بۆ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەر.

• لەساڵی ۱۹۸۲ تاوەکو ۱۹۸٤ ئەرکی سەرۆکایەتی بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی لەزانکۆی سەلاحەددین پێ سپێردراوە.
• تاکو ئێستا سەرپەرشتی چەندین نامەی ماجستێری کرلووە لە ئەدەب، فۆلکلۆر، رۆژنامەگەری، ئەدەبی نوێی کوردیدا.
• بەشداری دەیان لیژنەی ووتوێژی خوێندنی بالاّ بۆ پلەی ماجستێرو دکتۆرای کردووە.

• لەناو رێکخراوو کۆمەڵەکاندا ئەم پلانەی خوارەوەی بەهەڵبژاردن وەدەست هێناوە:

- جێگری سەرۆکی وەرگێرانی کوردستان.
- سەرۆکی لیژنەی ئامادەکردنی کۆمەڵەی فۆلکلۆری کوردی.
- ئەندامی دەستەی بالاّی کۆمەڵەی شەهیدانی کوردستان.
- ئەندامی دەستەی بالاّی سەرجەم رێکخراوە جەماوەرییەکان.
- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد.

• دەیان بەرهەمی ئەدەبیو رۆشنبیریی لەرۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردستانو عێراقدا بلاّوکردۆتەوەو بەچاپ گەیاندووە ئەمەی خوارەوە ناوونیشانی بەشێکە لەو بەرهەمانەی:
- کۆمەڵە رازێك بۆ منالان - لەرووسییەوە وەرگێراوە.
- دابو نەریتی کوردەکان - لەرووسییەوە وەرگێراوە.
- ناوەرۆکی فیکریو ئەدەبیو پەندو قسەی نەستەقی کوردی - نامەی دکتۆراکەیەتی لەرووسییەوە وەرگێرلوە بۆ کوردی.

- لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی لە عێراقدا
- لە رووسی یەوە وەری گێراوە.
- ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی - بەشەکانی کوردی زانکۆکانی هەرێمی کوردستان لە پۆلی سێ دەخوێندرێ.
- ئەدەبی کوردی بەشی پەخشان - لە بەشەکانی کوردی زانکۆکانی هەرێمی کوردستان لە پۆلی یەك دەخوێندرێ.

- ئەدەبی کوردیو هونەرەکانی ئەدەب.
- گەشتێك بە جیهانی شێخ رەزای تاڵەبانی - روخسارو ناوەرۆکی شیعرەکانی - .
- پەندو قسەی نەستەق لە وەرزەکانی ساڵنامەی کوردی.

- نهێنی ژمارە (٧) لە کەلەپووری گەلانو کورددا.
- فیراقو جودایی لە شیعرەکانی مەلای جەزیری دا.
- هەلبژاردەی شیعری شاعیرانی کلاسیکی کرمانجی ژووروو.
- لێکۆڵینەوەی زانستی فۆلکلۆر لە ئەورووپاو کوردستان.
- سلێمانی لە ئەدەبی فۆلکلۆردا.
- ئەحەی کرنۆ قارەمانی گاڵتەو گەپی شاری سلێمانی.

- نرخو بەهای لای لایەی دایك لە ئەدەبی منالاّن.
- حیکایەتی خورافی لە رووی موفولوژیەوە.
- کێشەی زاراوەو پێناسەی فۆلکلۆر.
- رەمزی مار لە کەلەپووری گەلانو کورددا.
- گلگامش لە نێوان ئەفسانەو داستان دا.
- دەنگی ئافرەتی کورد لە نێوان شاعیرانو دەنگی رەسانایەتی خۆیدا.
• گەلێك بەرهەمی ئامادەیە بۆ چاپ یان لە ژێر چاپدایە، ئەمەی خوارەوە ناوونیشانی هەندێکیانە:
- کۆکردنەوەو تۆمارکردنی فۆلکلۆر.
- رێو رەسمی شینو لاوانەوەی کوردەواری.

## سەکۆی زانکۆ

# پرۆفیسۆر دکتۆر خلیل اسماعیل محمد



پرۆفیسۆر دکتۆر خلیل اسماعیل. مامۆستایەکی کارامەو شارەزاو دیاری گۆرەپانی رۆشنبیری ی کوردی یەو ناسنامەی شارۆچکە خنجیلانە دابڕاوە بێ نازەکەی خانەقین و مەندەلی یەو خوێنەری کورد ئەم دوو شارۆچکە قەشەنگە لەسایەی نووسراوەکانی ئەوەوە دەناسن و ئەویش لەسایەی خانەقین و مەندەلی یەوە دەناسن.

ئەم زاتە بەرێزە هەر لەسەرەتای حەفتاکان تاوەکو ئێستا لەزۆربەی رۆژنامەو گۆڤارە کوردی یەکان خاوەنی دەنگی رەسەنی خۆی بووەو لەدەیان کۆڕو کۆبوونەوەی رۆشنبیری و زانستیشدا لێرەو لەوێ بەلێکۆڵینەوەو نووسینی چڕوپڕ بەشداری کردووە.

ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەژیاننامەی زانستی و کارگێری. ئەم پرۆفیسۆرە بەرێزە:

• لەساڵی ١٩٤٥ لەشاری مەندەلی لەدایک بووەو خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی هەر لەوێ تەواو کردووە.

• لەساڵی ١٩٦٦ بروانامەی بەکالۆریۆسی بەپلەی زۆرباشە لەبەشی جوگرافیای کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.

• لەساڵی ١٩٧٣ بروانامەی ماجستێری لەزانکۆی بەغدا لەنامەی (جغرافية السكان) وەرگرتووە.

• لەساڵی ١٩٨٠ بروانامەی دکتۆرای لەزانکۆی بەغدا لەنامەی (جغرافية الاستيطان الريفي) وەرگرتووە.

• لەساڵی ١٩٧٤ لەزانکۆی سلێمانی دامەزراوەو کراوەتە سەرۆکی بەشی کوردی لەکۆلێژی ئاداب.

• لەساڵی ١٩٨٤ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەری دراوەتێ.

• لەساڵی ١٩٩٠ پلەی پرۆفیسۆری دراوەتێ.

• نوێنەرایەتی زانکۆی سەلاحەدینی لەزۆر کۆڕو کۆنگرە لەدەرەوەو ناوەوەی کوردستان کردووە لەوانە:

ـ کۆڕی جیهانی یەکەم بۆ پەرەپێدانی هۆزو زەلکاوەکانی باشووری عێراق ساڵی ١٩٨٦.

ـ کۆڕی زانکۆی موسڵ لەبارەی جوگرافیاو نەخشەدانان ساڵی ١٩٨٩.

ـ کۆنگرەی نێو دەوڵەتی ی پانزەهەم لەکۆماری میسری عەرەبی دا لەساڵی ١٩٩٠.

ـ کۆنگرەی یادی نەوەت ساڵەی لەدایک بوونی بارزانی نەمر لەهاوینەهەواری سەلاحەدین ساڵی ١٩٩٣.

• بەشداری زۆربەی کۆڕو کۆنگرەکانی زانستی ی کۆلیژی ئاداب و بەڕێوەبردن و ئابووری و یاساو رامیاری کردووە.

• زیاتر لەپەنجا لێکۆڵینەوەی زانستی ی هەیە زۆربەیان لەگۆڤارە زانستی و ئەکادیمی یەکان بڵاوبوونەتەوە.

• دەیان نووسینی جۆراوجۆری لەرۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە.

• ئەم کتێبە بڵاوکراوانەی خوارەوەی هەیە:

ـ قضاء خانقين ـ دراسة في جغرافية السكان بغداد ١٩٧٧.

ـ محاضرات في جغرافية البشرية ـ جامعة السليمانية ١٩٧٥.

ـ انماط الأستيطان الريفي في العراق/ بغداد ١٩٨٢.

ـ مبادىء جغرافية السكان ـ جامعة صلاح الدين ١٩٨٤.

ـ جغرافية الاستيطان الريفي ـ بالاشتراك ١٩٨٩.

ـ البعد القومي للتغيرات في الحدود الادارية لمحافظة كركوك اربيل ١٩٩٢.

ـ موسوعة الموصل الحضارية بالاشتراك جامعة الموصل ١٩٩٢.

ـ جغرافية كردستان العراق ـ جامعة صلاح الدين ـ لەژێر چاپدایە.

• سەرپەرشتی و توێژی زیاتر لە پانزە نامەی ماجستێرو دکتۆری لە زانکۆکانی بەغداو بەسرەو موسڵ و سەلاحەدین کردووە.

• وانەی لە زانکۆکانی بەغداو بەسرەو موسڵ و کوفە لە عێراق گووتۆتەوە، سەرەڕای وانە گوتنەوە لە زانکۆی یەرمووك لە ئوردن.

• بەشداری لە هەڵسەنگاندنی چەندین لێکۆڵینەوەی زانستی ی لە زانکۆکانی بەغداو موسڵ و سەلاحەدین بەگشت پلەکانەوە کردووە.

• دەیان نووسینی لەبارەی جوگرافیای مرۆیی هەیەو تایبەتمەندە بەنووسینی ئەو بابەتانەی کەپەیوەندی یان بەکوردو کوردستانەوە هەیە. ئەمەی خوارەوە ناونیشانی بەشێکە لەو نووسینانەی کەمشتێکە لەخەرواریْ چونکە خەرمانی بەرهەمەکانی ئەم زاتە بەڕێزە هێندە دەوڵەمەندە ڕەنگ بێت لەگۆشەیەکی وادا جێ ی نەبێتەوە:

- التحليل المكاني للتنمية السياحية في منطقة كوردستان.
- المستوطنات الريفية في كردستان العراق بين التجميع والترحيل.
- اصل الكرد، دراسة في جغرافية الاجناس.
- التوزيع الجغراني للسكان الكرد في العراق.
- حدود اقليم كردستان.
- الكرد في الاحصاءات الرسمية لسكان العراق.
- التوزيع الجغراقي للسكان الكرد في قضاء خانقين.
- مدينة السليمانية، دراسة في خصائصها الديموغرافية.
- الاستيطان الريفي في محافظة السليمانية.
- الخصائص الديموغرافية لسكان المراكز الحضرية في محافظة دهوك.

• تاكو ئێستا زیاتر لە(٣٠) نووسراوی سوپاس و ڕێزلێنانی ئاراستەکراوە لەوانە لەلایەن:

- یەکێتی ی نیشتمانی ی کوردستان.
- هێژا مەسعود بارزانی.
- وەزیری خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی ی.
- کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبی یەکان.
- ئەمینداریێتی ی گشتی ی یەکێتی ی مێژوونووسانی عەرەب.

سەکۆی زانکۆ

# دکتۆر عبداللە حداد



دکتۆر عبداللە حداد یەکێکە لەکەسایەتی یە دیارەکانی شاری هەولێر کەتەمەنی رۆژنامەنووسی و رۆشنبیری ی و زانستی ی زیاتر لەچارەکە سەدەیەکە. دەتوانین بڵێین ناوی ئەم زاتە بەرێزە بۆتە بەشێک لەمێژووی شاری هەولێری دێرین و زۆربەی ئەدیب و رۆشنبیرانی ئەم شارە نازیزە ئاشنایی یان لەگەڵیدا هەیە بەڵام سەرەڕای ئەوەش ژیانی پڕ لەچالاکی ی ئەم زاتە هێشتان زۆر لایەنهێنی ی تیادا ماوە، کەژیاننامە زانستی یەکەی بەشێکە لەم نهێنی یانە بۆیە بەپێویستمان زانی بەپێ ی توانا هەندێک تیشک بخەینە سەر ئەم لایەنە.

• ناوی تەواو و ڕەچەڵەکی:

عبداللە حاجی محمد مەلا احمد حاجی مەلا هیدایەت حاجی داود حاجی احمد سلیمان ئاغای شافعی هەولێر زادەیە و بەدکتۆر عبداللە حەداد ناسراوە.

• مەڵبەندو جێگەی بنەماڵەکەیان هەر لەکۆنەوە گوندی «چیمەن»ی دەوروبەری و شارە دێرینەکەی هەولێر بووە، باپیرە گەورەیان لەساڵی ١١٠٥ هـ (١٦٩٦) زایینی لەهەولێر ـ گەڕەکی تەکیە ـ نیشتەجێ بووە و دیوان و مەقامیان لەهەولێر و لە ١٢٠٥هـ (١٧٩٠ زایینی) حاجی داود باپیرە گەورەی دکتۆر عبداللە مزگەوتی گەورەی بازێڕی دروست کردووە کەهەر بەناوی مزگەوتی (حاجی داود)ناودارە.

• لەکۆتایی چلەکاندا لەشاری هەولێر لەدایک بووە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی تیا تەواو کردووە.

• لەساڵی ١٩٧٢/ ١٩٧٣ بەکالۆریوس لەبواری زمانی کوردی لەکۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.

• لە ١٩٨٤/٦/٢٦ نامەیەکی بەناونیشانی (شێخ رەزای

تاڵەبانی ١٨٣٥_١٩١٠، لەگەڵ رۆژنەی شیعرەکانی ی کوردی‌و فارسی‌و تورکی) بەزانکۆی سۆربۆن پێشکەش کردووەو بروانامەی دبلۆمی مەترینی بەپلەیەکی بەرز لەسەر وەرگرتووە.

• لە ١٩٩٥/٦/٢٧ دبلۆمی دراساتی قوڵی DEA لەزانکۆی سۆربۆن وەرگرتووە نامەکەی بەناونیشانی (وورد بوونەوە لەسەر چاوەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی) پێشکەش کردووە.

• لە ١٩٨٨/١٢/١٢ نامەی دکتۆرای بەناونیشانی (دیراسەی مێژووی ئەدەبی کوردی لەکوردستانی باشوور ١٨٢٠_١٩٢٠) پێشکەش بەزانکۆی سۆربۆن کردووەو بروانامەی دکتۆرای وەرگرتووە.

• زۆربەی ژیانی بۆ بوارەکانی رۆشنبیری‌و زانستی تەرخان کردووەو هەر لەسەرەتای شەستەکانەوە تاکو ئێستا لەدەیان کۆڕو چالاکی رۆشنبیری‌و ئەدەبیدا بەشداری کردووەو دەیان ووتارو باس‌و لێکۆڵینەوەو بەرهەمی تری ئەدەبی بەزمانی کوردی‌و عەرەبی بڵاوکردۆتەوەو خاوەنی گەنجینەیەکی دەوڵەمەندە لەکتێبی ئەدەبی‌و رۆشنبیری‌ی بەزمانی کوردی‌و عەرەبی‌و فەرەنسی‌و فارسی‌و تورکی‌و ئەڵمانی‌و ئینگلیزی.

هەروەها دەیان چاپکراوو بەڵگەنامەو دەستنووسی دەگمەنی بەزمانەکانی رۆژهەڵات‌و رۆژئاوای بەخۆوە گرتووە.

• لەگەڵ دەرچوونی رۆژنامەی (التآخي) لەبەغدا ساڵی ١٩٦٧ بەچەندین باس‌و ووتاری ئەدەبی‌و رۆشنبیری سەبارەت بەئەدەبی‌و کوردی‌و ناساندنی لایەنە پرشنگدارەکانی رۆشنبیری کوردی بەشداری کردووە.

هەروەها دوای مۆرکردنی رێککەوتنامەی یانزەی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ هەمیسان رۆڵێکی دیاری لەبواری خزمەتکردنی ئەدەبی کوردی بینیوەو دەیان باس‌و لێکۆڵینەوەی بەکەڵک‌و رەسەنی لەبارەی ئەدەب‌و رۆشنبیری کوردی بڵاوکردۆتەوەو وەکو نووسەرێکیش تیایدا بەشداری کردووە.

ئەوەی شایەنی باسە، ووتارو لێکۆڵینەوەکانی ئەم زاتە بەرێزە سەرنجی نێوەندی رۆشنبیری کوردستان‌و عیراق‌و رۆژهەڵاتناسیشی راکێشاوە.

• ماوەیەكی زۆر بڕێ بەرچاوی بینیوە لەبواری ڕۆژنامەگەریدا و ئێستاش سەرنووسەری گۆڤاری (كاروانی ـ ئەكادیمی)یە كەلەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی كوردستانەوە دەردەچێت. هەروەها ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی گۆڤاری (زانكۆ بۆ توێژینەوەی ئینسانی).

• لەسالی خوێندنی ١٩٩٢ـ١٩٩٣ بەشێكی تازەی كوردی لەكۆلیژی پەروەردە كراوەتەوەو هەر لەو كاتەوەو تاكو ئێستا خۆی سەرۆكی ئەو بەشەیەو سالی خوێندنی ١٩٩٥ـ١٩٩٦ خولی یەكەمی قوتابییەكانی ئەو بەشە دەرچوون.

• لەچەندین لیژنەی گرینگ بەشداری كردووە لەوانە یەكخستنی پرۆگرامی زمان و ئەدەبی كوردی لەزانكۆكانی هەرێم و لیژنەی دیراساتی كوردستانی.

• تاكو ئێستا لەكۆلیژی ئاداب و كۆلیژی پەروەردەو مافی ئێوارانی زانكۆی سەلاحەدین ـ هەولێر ئەم وانانەی خوارەوەی ووتۆتەوە:

ڕێبازە ئەدەبییەكان، ئەدەبی كوردی، ئەدەبی بەراووردكاری، زمانی فەرەنسی، دەنگسازی (علم الصوت)..هتد.

• دەیان پارچە نووسین و لێكۆلینەوەی هەمەچەشنەی لەبوارەكانی ئەدەب و ڕۆشنبیری بلاوكردۆتەوەو چەندین كۆڕی لەم بارەیەوە گێڕاوە، ئەمەی خوارەوە ناوونیشانی بەشێكە لەو بەرهەم و چالاكییانەی:

ـ شیعرو ئەدەبییاتی كوردی لەشاری هەولێر (١٩٠٠ـ١٩٤٥).

ـ سەرەتایەك بۆ دیراسە كردنی بەرەو پێشەوەچوونی هەولێر لەنێوان سالانی ١٧٧٠ تاكو ١٨٢٠.

ـ ڕاستكردنەوەی هەندێ هەلەی باو دەربارەی شاری هەولێر.

ـ شاعیری كورد برهان جاهد[1] (١٩١٨ـ١٩٩١).

ـ هەردی نغمة رومانتیكیة من كردستان.

ـ كتابێك بەناونیشانی (لعنة الالهات الأربع) لەچاپخانەی لیواء لەسالی ١٩٦٩ لەبەغدا چاپ كراوە.

ـ ذكری گوران بقلم الدكتور معروف خزنەدار لەزمانی كوردییەوە وەری گێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی لەگۆڤاری (الثقافة الجدیدة) بلاوكراوەتەوە.

ـ قصیدة ونبذة عن حیاة الشاعر الكردي الراحل یونس رؤوف دلدار لەگۆڤاری (الاقلام)دا بلاوكراوەتەوە.

- الشيخ محمد الخال... لمحة عن حياته ونبذة عن مؤلفاته (التآخي).
- محمدامين زكي: قلم معطأ في سفر التأريخ الكردي. (التآخي).
- نظرة في كتاب الهدية الحميدية في اللغة الكردية. (التآخي).
- درة ثمينة من التراث الثقافي الكردي (ده ئه‌لقه‌یه).
- شێره به‌فرینه‌کانی پیره‌مێرد.
- كلمات في رحيل گيو كوكرياني.
- مدارس السليمانية في اواخر القرن التاسع عشر.
- معلومات نادرة عن اربيل قبل قرن ـ گۆڤاری (كاروان) ژماره (٥).

- ملف عن تدريس اللغة الكردية في معهد اللغات والحضارات الشرقية في باريس (كاروان ـ ژماره ـ٤٩).
- المستشرقون والدراسات الكردية.

- جولة في محراب نالى.
- الاستاذ مسعود محمد وسيرته الذاتية.
- الشيخ محمد الخال... كلمة وفاء..
- هه‌ولێر له‌دوو قه‌سیده‌ی نه‌وشیروانی به‌غدادی‌دا. (رۆشنبیری نوێ).
- • به‌شداری موناقه‌شه‌ی ماسته‌رنامه‌ی خواره‌وه‌ی کردووه:
- ره‌نگدانه‌وه‌ی له‌یلاو مه‌جنون له‌ئه‌ده‌بی کوردی‌دا.

- بینای هونه‌ری چیرۆکی کوردی.
- لێکۆڵینه‌وه‌یه‌کی ره‌خنه‌یی له‌چیرۆکه‌کانی محه‌مه‌د مه‌ولود مه‌م
- شیعری سیاسی کوردی له‌کوردستانی باشووردا ١٩١٨ـ١٩٢٠.
- رۆڵی شاری سێمانی له‌ئه‌ده‌بیاتی کوردی‌دا تاکۆتایی سه‌رده‌می بابانه‌کان.

## سەکویێ زانکو



### د. احمد الصفار

- د. احمد سليمان الصفار ل سالا ١٩٥٧ لباژێرێ زاخو هاتيە دونيايێ.

- خاندنا سەرەتایی‌و ناڤنجی ل زاخو بديماهی ئينايە.

- خاندنا ئامادەیی ل باژێری (رمادی) لژێر عيراقێ ل سالا ١٩٧٦ بديماهی ئينايە دەمێ مالا وان لوی باژێری يا نەفی کری بو.

- بروانامە بکالوريوس ل (الاحصاء والتخطيط) ژ کوليژا ئابوری ل زانکويا موسل ل سالا ١٩٨٠ وەرگرتيە.

- بروانامە ماجستير بناڤێ [السياسة الضريبية في البلدان النامية مع اشارة خاصة الى العراق] ل سالا ١٩٨٣ ل زانکويا موسل وەرگرتيە ب پلا جيد جدا.

- هاتە دامەزراندن ل کوليژا قانونێ ل زانکويا موسل سالا ١٩٨٤ تا ١٩٩٥.

- بروانامە دکتوراه لژێر ناڤێ (الضريبة على رقم الاعمال) يانکو (ضريبة القيمة المضافة) ل سالا ١٩٩٠ ل زانکويا موسل وەرگرت.

- ل سالا ١٩٩٣ گەهشتە پلا (استاذ مساعد).

هەتانهو (١٥) ليکۆلينێت ئابوری‌و راميارى ل گوڤارێت [الثقافة الجديدة، آداب الرافدين، گولان تنمية الرافدين، مەتين، گازى] بەلاڤکرينە.

- نها پەرتوكەكا مەنهەجی لژێر چاپ هەیە لدور ئابوریا مالیەتا گشتی بو خویندكارێت زانكویێ.
چاڤدێر یا كری لسەر چەندەها بروانامێت ماجستێری ل زانستێت ئابووریێ مالی.

- ئەندامێ لێژنا ئابوریيە ئەوا سەر ب دیوانا پارێزگەها دهوك.

- پشكداریا كری ل چەندەها سیمنارلو وەرزێت روشنبیری یێت زانكویێت بەغدا، موسل، دهوك، صلاح‌الدین.

- ئەندامێ لێژنا ئیستیشاريیە یا بجهـ ئینانا بریارا ١٩٨٦ لپارێزگەها دهوك.

- نها راگرێ (عمید) كولیجا زانیارێت ئابوریێ یاسا ل زانكویا دهوك.

- نوی ترین بزاڤا من یا رەوشەنبیری ئەو بو دەمێ من سمینارەك ل وەرزێ روشنبیری یێ زانكویا دهوك پێشكێشكری لژێر ناڤێ [ملاحظات حول اقتصاد كردستان العراق مع اشارة خاصة الى ميزانية ١٩٩٧].

# سەکۆی زانکۆ



## صابر محمد علی

- دکتور صابر محمد علی (تایبەتمەندێ باتنی) (اخصائی باطنیة).

- سالا ١٩٥٨ لخانەقین لپارێزگەها دیالە هاتیە سەر دونیایێ.

- خاندنا سەرەتاییو ناوەندی لقوتابخانا (نفط خانە) لخانەقین بدیماهیک ئینایە.

- خاندنا ئامادەیی سلیمانییو برێژا ٨٠٪ بدیماهیک ئینایە.

- سالا ١٩٨٣ کولیژا نوژداری لزانکویا سلیمانیێ بدیماهیک ئینایەو ئێکەم دەرچوویە لسەر خولا خو.

- سالا ١٩٩٢ لبەغدا هاتیە وەرگرتن بو بدەستڤە ئینانا باوەرناما دکتوراو سالا ١٩٩٦ باوەرناما (بورد) پشکا باتنی (دکتوراه باطنیە) لدور بابەتێ (ئەگەرێن زکێ چوونا مزمن لجەم نەخوشێت نەخوشخانا بەغدا یا فرکرنێ بدەست ڤە ئینایەو ب پلا چارێ دەرکەفتیە دناڤ بەرا ٣٩ قوتابیێن کورو کچ.

- ماموستایێ بابەتێ (باطنی) ب لکولیژا نوژاریێ زانکویا دهوکێ.

- لدەمێ خاندنا خو بو باوەرناما (دکتوراه) ئامادەی هەمی کورو سمینارێت خاندنێ بوویە ل (مدینة الطب) لبەغداو نەخوشخانا (ابن البیطار)و نەخوشخانا رەشید یا سەربازی.

## سەكوى زانكو

## د. عزالدين شيخ حسن جميل نەتروشى



- سالا ١٩٥٩ئ ل دەڤەرا شێخان لسەر پارێزگەها مێسل ژ دایک بوویە.
- خویندنا خویا سەرەتایو ناڤنجیو ئامادەی ل پارێزگەها هەڤلێری بدیماهی ئینایە، ژ دواناوەندیا پەیمانگەها ئیسلامی دەرچویە بپلا سەرکەفتیێ ئێکی لسەر پەیمانگەهێت ئیسلامی ل عیراقێ.

- سالا ١٩٨٠ ل کولیژا شەریعێ ل کولیژا شەریعەتی ل زانکویا بەغدا دهێتە وەرگرتنو لسالا ١٩٨٤ بدیماهیک دئینیتو دبیتە دەرچویێ ئێکی لسەر پولا خو.

- دهێتە وەرگرتن ل خواندنگەهێت بالا - ماجستیر ١٩٩٠ پاشی پلا ماجستیرێو شەریعەتو زانستێن ئیسلامی ل سالا ٩٩٣ ب پلا هەرەباش وەردگریت ئەو ژی ژناما

خویا بناڤێ (الامام القشيرى) ومنهجه في تفسير الطائف الاشارات.
-باوەرناما دکتوراه ل سالا ١٩٩٦ ئ وەردگریت لسەر بابەتێ (منهج اسماعيل حقي البروسوي في تفسير روح البيان) بپلا هەرە باش.
- ماموستا بویە پتر ژ دوو سالا ل کولیژا پەروەردێ ل زانکویا صلاح الدين.
- بو دەمێ دوو سالا ماموستا بویە ل زانکویا دهوکێو ڤێگا ڤێ ژی جێگرێ راگرێ کولیژا شەریعەتێو خویندنێن ئیسلامیە ل دهوکێ.
- دوو ڤەکولین یێن هەین ئەو ژی:
١- ل دور دامێنانێو بابەتێ (اصول الفقه الاسلامی)دا.
٢- ل دور پەیرەوێن هندەک شروڤەکەرێن کورد ل کوردستانێ.

## سەکۆی زانکۆ

# دکتۆر فەرهاد حەسەن عەزیز
## کۆلێژی پەروەردە



- ناوی فەرهاد حەسەن عەزیزەو ناسراوە بە سارمەمی.
- لەسالی ١٩٤٨ لەشارۆچکەی قوشتەپەی سەر بەپارێزگای هەولێر لەدایک بووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتاییو ناوەندیو

دواناوەندی لەشاری هەولێر تەواو کردووە
- بەکالۆریۆسی لەزانستەکانی کشتوکاڵ لەزانکۆی سلێمانی لەسالی ١٩٧٢ تەولو کردووە.
- دبلۆمی لەزانستەکانی کشتوکاڵ لەزانکۆی سۆفیا لەبولغاریا لەسالی ١٩٧٧ وەرگرتووە.
- بۆ ماوەی چواردەساڵ لەداموو دەزگا کشتواکالیە میرییەکان کاری کردووەو لەو ماوەیەدا بەشداری چەندین خولی فێربوونو بەسەرکردنەوەی مەیدانی لەناوەوەو دەرەوەی وولات کردووە.
- بڕوانامەی ماستەری لەژینگە لەزانکۆی بانکر نوری ویلز لە بەریتانیا لەسالی ١٩٨٥ وەرگرتووە
- لەسالی ١٩٨٦ گوێزراوەتەوە بۆ زانکۆی سەلاحەدینو پلەی مامۆستای یاریدەدەری دراوەتێ.
- لەسالی ١٩٩٧ بڕوانامەی دکتۆرای لەژینگە لەزانکۆی سەلاحەدین وەرگرتووە.

● لەساڵی ١٩٨٩ پلەی مامۆستای پێ بەخشراوە.
● دووكتێبی لەبارەی ژینگەو فەسڵەجە بەهاوبەشی لەگەڵ دكتۆر كەریم ساڵح عەبدول وەرگێڕاوە.
● ئێستا لێپرسراوی كاروباری زانستیو توێژینەوەی

زانستییە لەزانكۆی سەلاحەدین.
● ئەم نووسیرو لێكۆڵینەوانەی خوارەوەی هەیە:
* ئەو لێكۆڵینەوانەی بەزمانی ئینگلیزی ئەنجام دراون ئەمانەن

-The Ce necept Of Relative Yield Advantages From Intercropping . Zanco. 5,3:33-70 (1988).

– The Reeponse Of Leafless Pea To Novthern Iraqi Conditions. 1- Effect Of Dates Of Sowing and Density. Zanco, 2,1: 31-48. (1989).

– The Response of Leafless Pea to Northern Iraqi Conditions. 2-Effect of Autumn and Spring Sowings. Zanco. 2,3:31-41. (1989).

* ئەو لێكۆڵینەوانەی خوارەوە بەزمانی عەرەبی ئەنجام دراون:

– دراسة عن الزراعة المختلطة بين الشعيرو البزاليا المزروعتين لكثافات نباتية مختلفة Zanco, 5,3: تحت الطبع(١٩٩٢).

– تأثير سماد N.P.K ومعوق النمو الـ Dikegulac في النمو والتزهير لنبات حلق السبع. 19 :,Zanco. 4,3- .34(1991)

- لەساڵی ١٩٨٩ پلەی مامۆستای پێ بەخشراوە.
- دووکتێبی لەبارەی ژینگەو فەسلەجە بەهاوبەشی لەگەڵ دکتۆر کەریم ساڵح عەبدول وەرگێراوە.
- ئێستا لێپرسراوی کاروباری زانستیو توژینەوەی زانستیە لەزانکۆی سەلاحەدین.
- ئەم نووسینو لێکۆلینەوانەی خوارەوەی هەیە:

* ئەو لێکۆلینەوانەی بەزمانی ئینگلیزی ئەنجام دراون ئەمانەن

-The Ce ncept Of Relative Yield Advantages From Intercropping. Zanco. 5,3:33-70 (1988).

– The Reeponse Of Leafless Pea To Novthern Iraqi Conditions. 1- Effect Of Dates Of Sowing and Density. Zanco, 2,1: 31-48. (1989).

– The Response of Leafless Pea to Northern Iraqi Conditions. 2-Effect of Autumn and Spring Sowings. Zanco. 2,3:31-41. (1989).

* ئەو لێکۆلینەوانەی خوارەوە بەزمانی عەرەبی ئەنجام دراون:

– دراسة عن الزراعة المختلطة بين الشعيرو البزاليا المزروعتين لكثافات نباتية مختلفة :Zanco, 5,3 تحت الطبع(١٩٩٢).

– تاثير سماد N.P.K ومعوق النمو الـ Dikegulac في النمو والتزهير لنبات حلق السبع. 19 :,Zanco. 4,3- .34(1991)



سەکۆی زانکۆ

## پرۆفیسۆری یاریدەدەر

# دوکتۆر سەردار یاسین سەرداری

یاریدەدەری راگری کۆلیژی پزیشکی، زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

لەساڵی ١٩٥٥ لەشاری هەولێری قەڵاو منارە لەدایک بووە.

قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی هەر لەشاری هەولێر تەواو کردووە.

بڕوانامەی (بەکەلۆریۆس)ی لەزانستەکانی کشتەکاڵ لەزانکۆی موسڵ لەساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ وەرگرتووە.

بڕوانامەی (ماستەر)ی لەپسپۆری (فسلجة الطیور) لەزانکۆی قاهیرە لەمیسر لەساڵی ١٩٨٠ لەسەر حیسابی خودی خۆی وەرگرتووە.

هەر لەساڵی ١٩٨٠ لەزانکۆی سلێمانی (کۆلیژی کشتوکاڵ) بەمامۆستای یاریدەدەر دامەزراوە.

لەساڵی ١٩٨٥ پلەی (مامۆستا)ی پێ بەخشراوەو لەهەمان ساڵدا نێردراوە بەپشووی خوێندن بۆ قاهیرە بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی دوکتورا.

لەساڵی ١٩٨٨ بڕوانامەی دوکتۆرای لە (تربیة الحیوان) وەرگرتووەو گەڕاوەتەوە نیشتمان.

لەساڵی ١٩٩١ پلەی (پرۆفیسۆری یاریدەدەر)ی پێ بەخشراوە.

چەندین کاری زانستی و کارگێڕی لەزانکۆی سەلاحەدین پێ سپێردراوە لەوانە:

- سەرۆکی بەشی (سامانی ئاژەڵ) بەوەکالەت لە (کۆلیژی کشتوکاڵ).
- راگری کۆلیژی پزیشکی بەوەکالەت و یاریدەدەری راگر لەساڵی ١٩٩٤ تا ئێستاش بەردەوامە، ئەندامی لیژنەی کۆلیژی پزیشکی و کشتوکاڵ.
- سەرۆکی لیژنەی (الترقیات العلمیة) لەکۆلیژی کشتوکاڵ.
- لێپرسراوی فێرکردنی بەردەوام (التعلیم المستمر) لەسەرۆکایەتی زانکۆ.

ئەم وانانەی خوارەوەی ووتۆتەوە:

١- لـەکۆلێژی کشـتوکاڵ (بەشـی سـامانی ئـاژەڵ) لەسـاڵانی ١٩٨٠_١٩٨٥: (مبادئ الانتاج الحيوانی- انتاج الدواجن- التفقيس وادارة المفقسات- الحلقات الدراسيه والمشاريع.

ب- لەکۆلێژی پەروەردە (بەشی زانستەکانی ژیان) لەساڵی ١٩٩١- تـا ئێسـتاش بەردەوامە: (الفسـلجه الحيوانيـه- Advanced Avian Physiology- قوتابيانی خوێندنی باڵا(ماجستێر).

ج- کۆلیـژی پزیشکیو کۆلیـژی پزیشـکی ددان لەسـاڵی ١٩٨٩ تـا ئێستاش بەردەوامە: ((١-الاحيـاء الطبيـة، پۆلـی یەکـەم - Medical Biology ٢-Advanced Cytology- قوتابيانی خوێندنی باڵا(ماجستێر) بەشـەکانی زانسـتە سـەرەکیەکان (العلـوم الاساسـيه). ٣-Advanced Genetics- قوتابیـانی خوێندنـی بـاڵا(ماجسـتێر) بەشـەکانی زانسـتە سەرەکیەکان)).

- سەرپەرشـتی ماستەرنامەی (٢ قوتـابی) لەپسـپۆریتی (فسـلجه الحيوان) لەبەشی زانستەکانی ژیان کردووە.

- بەشداری لەووتوێژی ماستەرنامەی زیاتر لـە (٨قوتـابی) لەهـەردوو کۆلیژی پەروەردەو زانست وەک سەرۆکی ووتوێژ یا ئەندام کردووە.

- لەچەندین کۆنگرەی زانستی لەدەرەوەو ناوەوەی عـیراق بەشـداری کردووە.

- ئـەندامی (جمعیـة الانتـاج الحيوانـي المصريـة) و (جمعيـة الوراثـة المصرية)یە.

- بەشـداری لـەخولی (الالكتروفوريســز الدوليـه-Electrophoresis) لەقاهیرە (لەساڵی ١٩٨٧) کردووە.

ئەم توێژینەوە زانستیانەی خوارەوەی بڵاو کردۆتەوە:

1- Effect of some Managerial Factors on Egg Weight and Progeny Weight in Medium- Sized White Turkeys. Zanco, Vol.2, No.3, 1984.

2- Effect of Restricted Feeding During Growing Period on Subsequent Reproductive Performance of Local Iraqi Turkey. Zanco, Vol.3, No.3, 1985.

3- Effect of Strain and Temperature on Response of Local Iraqi Turkey Males During Semen Collection. Iraqi Vetrenary Medicine Jornal, No.10, 1986.

4- Effect of of Age and Sex on Growth Characteristics and Carcass Composition of Local Iraqi Turkey. Zanco, Vol.2 No.1, 1988.

5- Effect of Feed Restrication on Local Iraqi Turkey During the Growing And The Performance At 24 Weeks of Age.

6- The Phenotypic Performance Of Reciprocal Cross Of Local Turkey Strains. Iraqi, Journal Of Agricalture Science. Vol.2, No.2, 1989.

7- Force Molting In Domestic Fowl Hybrids. المؤتمر الثالث لجامعة صلاح‌الدين- اربيل/١٩٩٧.

8-Semen Characteristics In Iraqi Turkey Males. المؤتمر العلمي السادس عشر لجمعية الانتاج الحيواني المصرية/١٩٩٥



# سەکۆی زانکۆ

## د. محمد شکری احمد زاویتەیی

### ژیاننامە

- د. محمد شکری احمد زاویتەیی
- ل سالا ١٩٤٨ ل بازێرێ دهوک ل دەڤەرا زاویتە ژ دایک بوویە.

- [illegible] سالا ١٩٧٣ باوەرناما پەیمانگەها خویندنێن [illegible] وەرگرتی‌یە.

- [illegible] سالا ١٩٧٣ دچیتە کولیژا شەریعەتی‌و قانونێ ل [illegible] (الازهر) ل قاهیرەو باوەرناما بکالوریوس لسالا [illegible] وەرگرتیە.

- [illegible] سالا ١٩٧٣ێ هەتا ١٩٨٢ێ بویە ئیمام‌و [illegible] مزگەفتا (حجي مصطفى)ی ل دهوکێ.

- [illegible] ١٩٨٤ باوەرناما دیبلوما بالا د پەروەردێ دا ژ [illegible] پەروەردێ ژ زانکویا (الازهر) وەرگرتیە.

- [illegible] ١٩٨٩ باوەرناما ماجستیر ژ کولیژا (اصول [illegible] زانکویا (الازهر) بپلا هەرە باش لسەر بابەتێ [illegible] هەکاری‌و شروڤە یاوی وەرگرتیە.

- [illegible] ١٩٩٦ باوەرناما (دکتوراه) ژ کولیژا (اصول الدین) ل زانکویا الازهر وەرگرتیە پشکا شروڤە کرن‌و زانستێن قورئانێ بپلا هەرەباش دگەل پلا (الشرف الاول) لسەر بابەتێ شروڤە کرنا (الضحاك) کومکرن‌و ڤەکولین‌و شروڤەکرن.

- ڤێگا ڤێ ماموستایە ل کولیژا شەریعەتی‌و خویندنێن ئیسلامی ل زانکویا دهوکێ.

- پشکداری دو وەرزێن رەوشەنبیری داکریە ئەوێن ل زانکویا (قاهیرە)و زانکۆیا (عین الشمس) هاتینە گێران.

- ژ بەر هەمێن وی یێن بەرهەڤ بوچاپێ.

١- مختص في العقيدة الاسلامية.

٢- الفرائض (الميراث).

٣- تحقيق كتاب (نزهة النفوس في حكم التعامل بالفلوس).

٤- خلاصة في اصول الفقهة.

## سەکۆی زانکۆ



# پرۆفیسۆری یاریدەدەر حمە نجم فرج جاف

راگری کۆلیژی پزیشکی _ زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر

• لەساڵی ١٩٤٦ لەگوندی کانی ماران لەناحیەی سەر قەڵای قەزای کفری لەدایک بووە.

• خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەکفری تەواو کردووە.

• خوێندنی ئامادەیی لەشاری کەرکوک تەواو کردووە.

• لەساڵی ١٩٦٩ کۆلیژی پزیشکی لەزانکۆی موسڵ تەواو کردووە.

• بۆ یەکەم جار وەک نوشدارێک لەشاری قەڵادزە دامەزراوە.

• لەساڵی ١٩٨٠ بۆ خوێندن رەوانەی بەریتانیا کراوەو لەوێ خوێندنی باڵای لەبواری پزیشکی تەواو کردووە.

• لەساڵی ١٩٨٤ بڕوانامەی ئەندامێتیی کۆلیژی نوشدارەکانی مەلەکی‌یەتی ئێرلەندە (MPCP) وەرگرتووەو پەیوەندی بەزانکۆی لەندەن کردووەو لەنەخۆشخانەی BROMPTON کەتایبەتمەندە بەنەخۆشییەکانی سینگ مەشقی کردووەو دبلۆمی تایبەتمەندێتیی لەنەخۆشی‌یەکانی سینگ (D.T.M) وەرگرتووە.

• لەساڵی ١٩٨٥ گەڕاوەتەوە کوردستان و وەک نوشدارێک لەنەخۆشخانەی ڕزگاری لەشاری هەولێر دامەزراوە.

• ساڵی ١٩٨٦ گوێزراوەتەوە بۆ کۆلیژی پزیشکی

لەزانکۆی سەلاحەدینو بۆتە مامۆستاو بڕیاردەری لقی پزیشکی.

• سالی ١٩٩٠ بۆتە هەڤالی کۆلیژی نوشدارەکانی نەخۆشی سینگ لەئەمەریکا (F. C.C p).

• لەسالی ١٩٩٠ بۆ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەر بەرز بۆتەوەو بۆتە سەرۆکی لقی پزیشکی.

• لەسالی ١٩٩٢ بۆ ئەندامێتی پەرلەمانی کوردستان هەلبژێردراوەو لەلیژنەی خوێندنی بالاو تەندروستیو کاروباری کۆمەلایەتی کاری کردووە.

• لەسالی ١٩٩٣ بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی خوێندنی بالای کوردستان.

• لەسالی ١٩٩٤ هەلبژێردراوە بەڕاگری کۆلیژی پزیشکی.

• سەرپەرشتی سەر سێ قوتابی کردووە بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی دبلومی بالا (لەئاستی ماجستێر) لەنەخۆشی‌یەکانی درم وەئێستاش بەردەوامە لەسەرپەرشتی کردنی قوتابی‌یەکی تر.

• بەشداری وتوێژی ماستەر نامەیەکی لەکۆلیژی پەروەردە کردووە.

• بەشداری گشت کۆنگرە زانستی‌یەکانی کوردستانی کردوو.

• نووسینو بلاوکراوەی هەمەجۆرەی لەبوارەکانی زانستی پزیشکی لەکەنالە جیاجیاکانی ڕاگەیاندن لەکوردستان بلاوکردۆتەوە.

• لەسالی ١٩٨٧ بەشداری کۆنگرەیەکی بۆ نەخۆشی‌یەکانی ڕۆژهەلاتی دەریای سپی ناوەڕاست کردووە کەلەبەغدا لەلایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ئەنجام دراوە.

• ئامادەی حەلقەیەکی دیراسی لەنوێ ترین پێشکەوتنەکان لەبواری نەخۆشی‌یەکانی سینگ لەبەریتانیا بووە کەلەسالی ١٩٨٧ لەلایەن ئەنجومەنی ڕۆشنبیری بەریتانیاوە بەستراوە.

• دەیان نووسینو لێکۆلینەوەی زانستی‌ی لەبواری پزیشکیدا لەگۆڤارە پزیشکی‌یەکانو زانستی‌یە هەمەجۆرەکان بلاوکردۆتەوە.

## سەکۆی زانکۆ



## د. محمد صهیب صبحی المفتی

سالا ١٩٦٤ ژ دایک بوویە

* خاندنا سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لبـاژێری هەڤلێرێ بدیماهیک ئینایە.

* دەرچوویێ ئامادەیا نضال ل هەڤلێر ب رێژا ٩١٫٥٪ و ئێکوبوویە ژ ١٠ قوتابیێن ئێکەم دەرکەفتین لسەر ئاستێ عێراقێ.
* سالا ١٩٨٧-١٩٨٨ بکالوریوسا (طب، جراحة) ژ کولیژا نوژداریێ لزانکویا صلاح الدین وەرگرتیە.
* هاتیە وەرگرتن بو خاندنا بلندو باوەرناما دکتوراه

(بورد) د نوژداریا گولچیسکا سالا ١٩٩٥ ژ زانکویا بەغداو جڤاتا بلندا تایبەت مەندیا نوژداری لدورناما وی بناڤێ.

(Clinico pathological evaluation ca. Bladder)

نهو ماموستایێ نوژداریا لولبینن ئەدراریە لکولیژا نوژداری لزانکویا دهوک.

ئەڤ ڤەکولینە ژی هەنە

١- ڤەکولینەک لدور (دوالی الخصية ومدى تأثيراتها على عقم الرجال).

٢- ڤەکولینەکا پاتولوجی پەنجە شیرا مەثانێ لعێراقێ.

# دکتۆر ابراهیم احمد شوان

## سەرۆکی بەشی کوردی لەکۆلێژی ئاداب



• لەساڵی ١٩٨٢ بەشداری ئەزمونی شەشی وێژەیی بەکالۆریای کردووە وبڕوانامەی ئامادەیی وەرگرتووە و هەر لەهەمان ساڵدا لەبەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆ سەلاحەدین - هەولێر وەردەگیرێ وساڵی ١٩٨٥ - ١٩٨٦ بڕوانامەی بەکالۆریوسی لەزمان و ئەدەبی کوردی بەپلەی یەکەم وەردەگرێ.

• لەساڵی ١٩٨٧ لەخوێندنی باڵا بەشی ماجستێر وەردەگیرێت و لەساڵی ١٩٨٩ بڕوانامەی ماجستێر لە ئەدەبی کوردی وەرگرتووە لەسەر نامەکەی کەلەسەر مەلا خلیلی موخلیس بووە.

• لەساڵی ١٩٨٩ بوەتە مامۆستا لەپەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایانی کوڕان لەهەولێر.

• لەساڵی ١٩٩٢ خۆی گوێزراوەتەوە بۆ کۆلێژی ئاداب ولەساڵی ١٩٩٣ لەخوێندنی دکتورا وەرگیراوەو لە١٩٩٦

بروانامەی دکتۆرای لەئەدەبی کوردیدا پێ دراوە لەسەر نامەی «شیعری سۆفیگەری و مەحوی».

• بەشداری لەووتوێژی ماجستێر نامەی قوتابی عبدالله خضر مولود بەناونیشانی لێکۆڵینەوەیەك لەشیعری حەمدی کردووە.

• دوونامیلکەی شیعری بەچاپ گەیاندووەو لەرۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکانیش هەندێك بابەتی شیعری و ئەدەبی بڵاوکردۆتەوە.

•ئەم باس و لێکۆڵینەوانەی بەدەستەوەیە:
ـ موخلیسی شاعیر لەژێر کاریگەریی حافیزی شیرازیدا.
ـ مەولود نامەی کوردی.
ـ مەلای جزیری لەروانگەی سۆفیگەرییەوە.
ـ ئەی ساکنی ریاضی مە دینە منەوەرە

• لەساڵی ١٩٥٠ لەگوندی گردعازەبانی سەربەناحیەی قوشتەپە لەشاری هەولێر لەدایك بووە وخوێندنی سەرەتایی لەوێ تەواو کردووە.

• خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی لەشاری هەولێر تەواو کردووە.

• لەساڵی ١٩٧٠ خانەی مامۆستایانی لەهەولێر تەواو کردووە ولە ١٩٧١/٣/٣٠لە گوندی شێخ شێروان بەمامۆستای سەرەتایی دامەزراوە .

## سەکۆی زانکۆ



## د. عمر یاسین ابراهیم

مامۆستای فەلسەفەی دەروونزانی لەکۆلیژی پەروەردە ــ زانکۆی سەلاحەدین

• لەساڵی ١٩٥١ لەشاری هەولێر لەدایک بووە.

• گشت قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لەشاری هەولێر تەولو کردووەو لەتەمەنی دەساڵیشدا قورئانی پیرۆزی ختم کردووە.

• ماوەی چەند ساڵێك مامۆستای سەرەتایی بووە لە ناحیەی هەریر.

• لەساڵی ١٩٨٤/١٩٨٥ لەکۆلیژی پەروەردە لەزانکۆی سەلاحەدین وەرگیراوەو خوێندنی بەشی دەروونناسی تەولو کردووە.

• لەساڵی ١٩٨٨/١٩٨٩ بڕوانامەی بەکالۆریوسی لەدەروونناسی وەرگرتووە.

• لەساڵی ١٩٨٨ تاکو ١٩٩١ بەناونیشانی مامۆستا لە پەیمانگای مامۆستایان لەهەولێر دامەزراوە.

• لەساڵی ١٩٩١/١٩٩٢ لەخوێندنی باڵا لەکۆلیژی پەروەردەی زانکۆی بەغدا لەبەشی پەروەردەو دەروونناسی وەرگیراوە لەساڵی ١٩٩٣ وتوێژی ماستەرنامەکەی ئەنجام داوە لەژێر ناوی: «دراسة مقارنة في بعض التغيرات التربوية بين المدارس المشمولة بالارشاد التربوي وغير المشمولة في منطقة الحكم الذاتي».

• لە ١٩٩٣/٥/٢٧ لە خوێندنی دکتورا لەزانکۆی بەغدا

هەرێمی کوردستان ژمارە ١٠٩ لە ١٥/٥/١٩٩٧

وەرگیراوەو لە سالّی ١٩٩٦ وتوێژی دکتۆرانامەکەی لەژێر ناوی: «المسايرة وعلاقتها بمفهوم الذات والقبول الاجتماعي للمراهق العراقي». ئەنجام دلوەو بەپلەی زۆرباشە سەرکەوتنی وەدەست هیناوە.

• لە خولی چۆنێتی . وانە ووتنەوە وانەی ووتۆتەوە، ئەم خولە لەلایەن کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدین بەرێوە دەچوو.

• ئەم وانانەی خوارەوە دەلّێتەوە:

**ـ الارشاد التربوي والصحة النفسية.**
**ـ علم النفس.**
**ـ مناهج البحث.**
**ـ علم النفس العام.**
**ـ علم النفس الرياضي.**

• بەنووسین لەهەندێک رۆژنامەو بلاوکراوەکانی هەرێمی کوردستان بەشداری کردووە.

## شەكۆی زانكۆ



## د. فەرهاد پیربالّ القصاب

• ناوی سیانی: فەرهاد پیربالّ عومەر.
• نازناو: القصاب.
• كات و شوێنی لەدایكبون: ١٩٦١/٨/٢٠ گەڕەكی خانەقا هەولێر (بەپێی دەفتەر نفوسی ژمارە ١٠٥٥٦٨ كە لە ١٩٦٢/٩/٥ لە بەڕێوەبەرایەتی نفوسی لیوای هەولێر دەرچووە).
• ژیانی كۆمەڵایەتی: لە ١٩٩٦/٩/٢ ژنی هێناوە و كچێكی هەیە بەناوی تنۆك
• ئەندامی هیچ كۆمەڵە و حیزب و ڕێكخراوێك نەبووە.

### ــ خوێندن:

• ١٩٦٨ــ١٩٧٦: خوێندنی سەرەتایی لەقوتابخانەی زاگرۆس؛ ناوەندیشی لەبرایەتی، لەهەولێر تەواو كردووە.
• ١٩٧٩: تەواوكردنی خوێندنی ئامادەیی لەبەشی ئەدەبی لە (ئامادەیی كوردستان) لە هەولێر.
• ١٩٨٣/٦/٢٧: تەواوكردنی خوێندن لەبەشی (زمان و ئەدەبیاتی كوردی) لەزانكۆی سەلاحەدین.
• ١٩٨٨/٩/٢٣: تەواو كردنی خوێندنی زمانی فەرەنسی و وەرگرتنی دیپلۆمی CAVILAM لەبارەی زمانی فەرەنسییەوە لە زانكۆی CLEREMONT لەشاری ڤیشی، لەباشووری فەرەنسا.
• ١٩٩٠/١٠/١٥: تەواو كردنی خوێندنی ماستەر DEA لەبارەی (سەرچاوەكانی چیرۆكی كوردی) لەزانكۆی سۆربۆن لەپاریسی سێیەم، بەپلەی Bien .

بەسەرپەرشتی پرۆفیسۆر شارل هنری دو فووشیکوور، بەڕێوەبەری بەشی لێکۆڵینەوەکانی ئێرانشسنازی لەزانکۆی سۆربۆن.

• ١٩٩٤/٣/١٤: وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا بەپلەی شەرەف Tres Honorable avec felicitations کە بەرزترین پلەی سەرکەوتنە، لەزانکۆی سۆربۆن لەپاریسی سێیەم. ناونیشانی تێزەکە: مێژوی نەشونماکردنی چیرۆکی کوردی (١٨٥٦ـ١٩٤٩). بەسەرپەرشتی پرۆفیسۆر شارل هنری دو فووشیکوور؛ هەروەها بە ئامادەبی لیژنەی گفتوگۆی ئەم ئەندامانە: د.کریستۆف بالایی، پرۆفیسۆر پیێر لۆکۆك، د.جۆیس بلاو، د. هوما ناطق، کە مامۆستای تایبەتمەندی ئەدەبیاتی ئێرانی و کوردین لەزانکۆی ناوبراودا.

## ـ شارەزایی و کارو پسپۆری

• ١٩٨٤: کارکردن لەراگەیاندنی یەکێتی نوسەرانی کوردستان لەناو شاخ.

• ١٩٨٥: دەرس دانەوەی زمانی کوردی (بەخۆرایی) لەچەند قوتابخانەیەکی تایبەت، لە کۆپنهاگن ـ دانمارك، بەمنداڵ و ئەو کوردە ئاوارانەی زمانی خۆیان بەباشی نەدەزانی.

• ١٩٨٦ـ١٩٩٣: کارکردن لەگۆڤاری رۆشنبیری یەکگرتن لەکۆپنهاگن ـ دانمارك.

• ١٩٨٩ـ١٩٩٤: کارکردن لەبواری تەرجەمەدا، وەك وەرگێڕ، بۆ ئەو پەناهەندە کوردانەی تازە دەگەیشتنە فەرەنسا؛ هەروەها بۆ ئەو وەفدە رۆشنبیری و سیاسیانەی لە کوردستانەوە سەردانی حکومەتی فەرەنسایان دەکرد.

• ١٩٨٩ـ١٩٩٣: بەشداریکردن لەسەرپەرشتی گۆڤاری هیوا، بڵاوکراوەی ئەدەبی ئەنستیتووی کورد لەپاریس.

• ١٩٩٠ـ١٩٩٣: بەشداریکردن لەچەندین بەرنامە لەبارەی کورد، لەرادیۆو تەلەفزیۆنەکانی فەرەنسادا.

• ١٩٩١ـ١٩٩٣: پەیامنێرو هاوکاری گۆڤارە کوردییەکانی نوودەم Nudem و خەرمانە لەستۆکهۆڵم.

• ١٩٩٤/٤/٣٠ـ١٩٩٦/١٠/٢٢: لەکولێژی ئاداب لەزانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر، لەبەشی کوردی بەمامۆستا دامەزراوە، دەرسی ڕێبازی ئەدەبیەکان و ئەدەبی نوێ بەبەشی کوردی؛ دەرسی زمانی

فەرەنسیش بەبەشی ئینگلیزی.

• ١٣/٨/١٩٩٤ـ١/٢/١٩٩٥: بەرپرسی لاپەڕە سێ لەرۆژنامەی کوردستانی نوێ لەهەولێر.

• ١١/١٩٩٤ تا ئێستا: سەرنوسەری گۆڤاری وێران لەهەولێر.

• ١٢/١٩٩٥ـ ٣١ی ئابی ١٩٩٦: بەڕێوەبەری گەلەری ئەربێللا لە هەولێر.

• ٩/١٩٩٦ تا ئێستا: بەڕێوەبەری دەزگای کتێب لەزانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر.

• ٢٣/١٠/١٩٩٦: تاکو ئێستا: مامۆستا لەبەشی کوردی لەکولێژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر. تاکو ئێستاش هەر لەوێ دەرسی ڕێبازە ئەدەبی یەکان و ئەدەبی نوێ دەڵێتەوە.

• ٣/١١/١٩٩٦ تا ئێستا: ئەندامی لیژنەی زانستی لەکۆلێژی پەروەردە لەزانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر.

• ٢/١٢/١٩٩٦ تا ئێستا: دەرسی زمانی فەرەنسی لەکولیژی زمان لەزانکۆی سلێمانی دەڵێتەوە.

• ١٩٩٥ـ١٩٩٧: ئەندامی لیژنەی گفتوگۆی نامەیەکی ماستەرو نامەیەکی دکتۆرا بووە لەکۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر.

## ـ کۆڕو کۆنگرەو کۆنفرانسەکان

• ١٩٨٦ـ١٩٩٧: زیاتر لەپەنجا کۆڕی ئەدەبی و رۆشنبیری سازکردووە لەشارەکانی کۆبنهاگن و ستوکهۆلم و پاریس و ڤینیس و هەولێرو کۆیەو سلێمانی.

• ٨/١٩٩٠: نوێنەرایەتی لە کۆنفرانسی قوتابیانی هەموو وڵاتانی جیهان لەباشوری فەرەنسا، بە ئامادەبوونی وەزیری مرۆڤایەتی فەرەنسا، بێرنارد کووشنەر.

• زستانی ١٩٩٢: کۆنگرەی زمانەوانی نوسەرانی کوردستانی تورکیا بۆ دانانی زاراوەو بەرەو پێشەوەبردنی زمانی کوردی، لە باشوری شاری ستۆکهۆلم لەسوێد کە لەژێر چاودێری ئەنستیتوی کوردی پاریس ڕێکخرابوو.

• ١٤ـ١٥/١٠/١٩٨٩: کۆنفرانسی نێودەوڵەتی (کوردەکان: مافی مرۆڤ و ناسنامەی رۆشنبیری) لەپاریس.

**ـ زمانزانی**

کوردی زمانی دایك، فەرەنسی، فارسی، عەرەبی ئینگلیزی.

**ـ هەندێك لە بڵاوکراوەکانی**

١ـ یەکەمین بابەتی بڵاوکراوەی بریتی بووە لەچیرۆکی (ناونیشانێکی نوێ) کە لەساڵی ١٩٨٠دا لەژمارەی تایبەت بەشانۆو چیرۆك لە گۆڤاری (رۆژی کوردستان)دا لەبەغدا بڵاوکراوەتەوە. تاکو ئێستاش زیاتر لە یازدە چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە، لەگەڵ چەندین شانۆنامە.

٢ـ یەکەمین کتێبی چاپکراوی بریتیە لەشانۆنامەی (ماڵئاوا ئەی وڵاتەکەم) کە لەساڵی ١٩٨٤دا لەیەکێتی نوسەرانی کوردستان لەناو شاخ چاپ و بڵاوکرایەوە.

٣ـ شانۆنامەی (بەیانی باش ئەی غەریب)، کۆبنهاگن ١٩٨٨.

٤ـ دیوانە شیعری Exil ، بڵاوکراوەی ئەنستیتوی کورد لەپاریس ١٩٩٢.

لە هەموو ئەم رۆژنامەو گۆڤارانەی خوارەوە، لەساڵی ١٩٨٠ بەولاوە، شیعروچیرۆك و شانۆنامەو تەرجەمەو وتارو لێکۆڵینەوەی بڵاوکردۆتەوە: بەیان، هاوکاری، رۆشنبیری نوێ، رۆژی کوردستان، نووسەری کورد، کاروان، کاروانی ئەکادیمی، هەرێم، کوردستانی نوێ، ئێستا، گوڵان، گەلاوێژی نوێ، سروە، رەنگاڵە، وڵات، رامان، وێران.

لەدەرەوەی وڵاتیشدا لەماوەی ساڵانی ١٩٨٥ تا ١٩٩٤: لەستوکهۆلم: مامۆستای کورد، بەربانگ، خەرمانە، رابوون، سەردەمی نوێ؛ لەئەڵمانیا: بەرهەم، پەڕەنگ، لەدانمارك، یەککرتن، دەروازە، لەنەرویج: هاوسەر،

لەئەمریکا: هەڵەبجە، بارزان، کوردستان، لەبەریتانیا: پەیڤ، لەفەرەنسا: هیوا، فرادیس، زیاتر لەسەدو بیست و پێنج بەرهەمی تەرجەمەو نووسراوی بڵاوکردۆتەوە.

**- ئەو کتێبانەی ئامادەن بۆ چاپ**

١- رۆمانی (سانتیاگۆ کۆمپۆستێللا) لەساڵی ١٩٩٤ پاکنووس کراوە لەپاریس.

٢- ئینجیل لەمێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا (١٤٠٠-١٩٥٨).

٣- رۆژنامەگەری کوردی بەزمانی بێگانە (١٨٩٧-١٩٥٨).

٤- مێژووی رەسم و بزوتنەوەی نیگارکێشی لەکوردستان دا (لەکۆنەوە تا ١٩٨٠).

٥- مێژووی تەرجەمە لەئەدەبیاتی کوردی دا (لەکۆنەوە تا ١٩٤٩).

٦- سەرچاوەکانی کوردناسی (٤٠١ پێش زاین - ١٩٠٠).

٧- مێژووی پەخشانی کوردی (١٤٠٠-١٩٢٠).

٨- مێژووی شانۆو جموجوڵی شانۆگەری لەکودرستاندا (لەسەدەی نۆزدەهەمەوە تا ١٩٥٨).

٩- مێژووی ئەدەبیاتی کوردی لەدوورەوەڵاتیدا (لەسەدەی هەژدەمەوە تاکو ١٩٩٤).

١٠- ئەلبومی وێنەی کورد لەئەرشیفی لێکۆڵینەوەی کوردناسەکاندا (لەسەدەی یازدەهەمەوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم).

١١- شانۆنامەی باوک نوسراوی ئۆگۆست ستریندبێرگ.

١٢- شانۆنامەی سۆزانیە شکۆمەندەکە، نوسراوی ژان پۆول سارتەر.

...ە کۆی زانکۆ

# کەریم شەریف قەرەچەتانی



+ لەساکی (١٩٦١) لە گوندی قەرچەتانی سەر بەناحیەی سورداش/ قەزای دوکان لە پارێزگای سلێمانی لەدایک بووەو خوێندنی سەرەتایشی هەر لەو گوندە تەولو کردووە

+ خوێندنی ناوەندی لەشاری سلێمانی تەولو کردووە.

+ لەسالی (١٩٧٩) ئامادەیی پیشەسازی سلێمانی/ بەشی میکانیکی تەواو کردووە.

+ لە ١/٣/١٩٨٠ وەک فەرمانبەر لەکۆلێژی کشتو کالی زانکۆی سلێمانی دامەزراوە.

+ لەسالی (١٩٨١) وەک قوتابیەکی دەرەکی (طالب خارجی) بەسەرکەوتوانە پۆلی شەشەمی ویژەیی (ادبی) تەواو کردووە.

+ لەسالی (١٩٨٦) کۆلێژی پەروەردە (بەشی پەروەردە دەروون زانی) زانکۆی مووسلی تەولو کرد.

+ لەساکی (١٩٨٩) بەپلەی (امتیاز) بڕوانامەی ماجستێری لەدەروون زانی منداڵو هەرزەکاردا لە کولێژی پەروەردەی زانکۆی بەغداد وەرگرتووە.

+ لەسالی (١٩٨٩) موە وەک (مامۆستای یاریدەر) لەکولێژی پەروەدە/ زانکۆی سەلاحەدین وانەکانی

دەروون زانی دەڵێتەوە.

+ لەساڵی (١٩٩٣) ناز ناوی زانستی (مامۆستای) وەرگرتووە.

+ لەساڵی (١٩٩٤) ەوە تاوەکو ئێستا سەرۆکی بەشی پەروەردەو دەروون زانیە لەکولێژی پەروەردەی/ زانکۆی سەلاحەدین.

+ وەک ئەکتەرو دەرهێنەرو نووسەر لەزۆر بەرهەمی شانۆیی و تەلەفزیۆنیدا بەشداری کرووە لەوانە (شانۆگەری دەردەوەی، پژمین فایلی (٦٧) _ تیپی شانۆی زانکۆی موسڵ (شانۆگەری بەرگە ئەفسووناویەکەی پاشا، رووبار_ تیپی شانۆی لاوانی سلێمانی) (ئو پەریتی پێلاوی سوور بۆ منداڵان، زنجیرەی تەلەفزیۆنی پاداشت) (بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوک تۆمار کراوە) (شانۆگەری پێکەنین بەبێ یاسا، فیلمی تەلەفزیۆنی چەقۆ) (تیپی شانۆی زانکۆی سەلاحەدین)

+ لەزۆربەی گۆڤارو رۆژنامەکانی هەرێمی کوردستان بەرهەمی زانستی بلاوکردۆتەوە.

+ کتێبێکی بەناو نیشانی (دەروازەی دەروون زانی) بەچاپ گەیاندووە هەروەها دوو کتێبی تری بەناو نیشانی (زیرەکی و چۆنیەتی پێوانەکردنی) گرفتە دەروونی و کۆمەلایەتیەکان) ئامادە کردووە بو چاپ.

+ چەندەها توێژینەوەی زانستی مەیدانی بەئەنجام گەیاندووە لەوانە( لاساری مێرد منداڵان، منداڵو ئیش کردنی، ئەو هۆکارانەی بوونەتە هۆی نزم بوونەوەی ئاستی زانستی لەقوتابخانەکانی هەرێمی کوردستان، جۆرەکانی راهێنانی کۆمەلایەتی، پاراسایکۆ لۆژیاو داهاتووی مرۆڤایەتی، هەڵسەنگاندنی توانا لێهاتوویی هەندێک لەمامۆستایانی باخچەی ساوایان).

+ بۆماوەی (٣) سێ ساڵ نزیکەی (١٢٠) هەلقەی لەبەرنامەی (خێزانو کۆمەڵ) بۆ تەلەفزیۆنەکانی هەرێمی کوردستان ئامادەو پێش کەش کردووە سەرەرای چەندەها رێپۆرتاژ دەربارەی دیاردە دەروونی و کۆمەلایەتی و پەروەردەییەکان.

سەکۆی زانکۆ

# ژیاننامە

## د. لاس جمال خورشید حویزی

+ سالا ١٩٥٦ لپارێزگەها واسط هاتیە سەر دونیایێ.

+ خاندنا سەرەتایی لقوتابخانا ئازادی ل هەڤلێرێ بدیماهیک ئینایەو هەردەم ئێکەم دەرکەفتیە.

+ خاندنا ناوەندی ل ئاڤنجیا دار السلام لبەغدا بدیماهیک ئینایەو سالا ١٩٧٤ ژ ئامادەیا الجمهوریە لبەغدا برێژا ٩٠% دەرچوویە.

+ سالا ١٩٧٩-١٩٨٠ بکالۆریوسا نوژداریێ لزانکویا بەغدا بدەست ڤەئینایەو لدیڤدا باوەرناما دکتوراه (بورد) لنوژداریێ بدەست خوڤە ئینایە.

+ بابەتێ (الجراحە العلمیە) لزانکویا المستنصریة کولیژا نوژداریێ خاندیە.

+ نهو مامۆستایێ بابەتێ شکەستنو تەشریحێبە لکولیژا نوژداری لزانکویا دهوکێ.

+ بەرپرسێ هوبا شکەستنیە لنەخوشخانا ئازادیو سەروکێ پشکا نوژداریێ بوویە بەری نهو



لنەخوشخانا ئازادی.

+ دگەلەک کونگرادا پشکداری کردیە، وەک:

١- کونگرێ زانستیێ ئێکێ- کومەلا نوژداریێ بەستیو شکەستنێ سالا ١٩٩٢ بەغدا

٢- کونگرێ زانستیێ دویێ- کومەلا نوژداریێ، خەستیو شکەستنێ سالا ١٩٩٣ بەغدا.

٣- کونگرێ زانستیێ زانکویا المستنصریە سالا ١٩٨٩.

نهو سەرپەرشتیا باوەرنامەکا ماجستێرێ دکەت لکەلیژا نوژداریێ لزانکویا دهوکێ، لبن ناڤێ (التحام العظم بالتحفیز الکهربائي).

ئەکۆی زانکۆ



ماموستای یاریدەدەر

# جەوهەر فەتاح سەعید

* دەرچووی کۆلیژی پەروەردە زانکۆی بەغدا
...ی سالی ١٩٧٦-١٩٩٧.
* ١٩٧٧/١١/٦ ماموستا لەدواناوەندی گەلالە.
* ١٩٨٨ لەکۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدین
...ی بالا (ماجستیر) وەرگیراوە کەلەژێر ناوی
...دراسە المورفولوجیە- تصینة عن الجنس Lappwla
... Baraginacea فی العراق) لەبواری پۆلین
...

* سالی ١٩٩٠ تا ١٩٩٢ ماموستا بوو لەپەیمانگەی
...ی ماموستایان.
* ١٩٩٢/٨/٢٠ گواسترایەوە بۆ میلاکی زانکۆی
سەلاحەدین- کۆلیژی پەروەردە/ بەشی بایۆلۆژی
ماموستای یاریدەدەر.

* ١٩٩٤ بووە بەبریاردەری بەشی بایۆلۆژی.
* ١٩٩٦ بووە بەیاریدەدەری راگری کۆلیژی پەروەردە تاکو ئێستا.
* ئەم وانانەی وتۆتەوە:
١- پۆلین زانی پراکتیک- قۆناغی دووەم.
٢- پۆلین زانی تیوری- قۆناغی دووەم.
٣- تحلیل کتب (لێکدانەوەی کتێب) قۆناغی چوارەم.
٤- سەرپەرشتی کردنی پرۆژەی توژینەوەی قۆناغی چوارەم.
* هەروەها ئەم توێژینەوانەی ئەنجام داوە.
- دراسة أنتشار النبات في جبل سفين لمنطقة شقلاوة بەشێوەیەکی هاوبەش کەلەتەولو بوون دایە.
- دراسە حبوب اللقاح للنباتات Hefercaryum Baraginaleae

هەرێمی كوردستان — پێنج شەممە ١٣/١١/١٩٩٧ز - ٢٦٩٧ی كوردی - ژمارە (١٢٤)

## سەكۆی زانكۆ



### د. فــــەرهاد خورشـــــید ســـــلیڤانی نـــوژداری تایبەتمـــەند

* سالا ١٩٥١ لزاخو هاتیە سەر دونیایێ.

* خاندنا سەرەتایی لزاخو بدیماهیک ئینایە.

* خاندنا ناوەندیو ئامـادەیی ل میسـل بدومـاهیک ئینایەو دەرچوویێ ئامادەییا مەلبەندیە سالا ١٩٦٨ لمیسل.

* لدیڤدا دچیتە كولیژا نوژداریێ لزانكویا میســل و لسالا ١٩٧٤ باوەرناما بكالوریوس لنوژداریێ وەردگریت.

* باوەرنامـا جڤاتـا عـەرەبیا تایبەتمـەندیا نـوژداری وەردگریتو سالا ١٩٨٦ باوەرناما دكتوراه بنوژداریـا گشتی وەردگریتو ئێكبوو ژوان ٣ كەسێن ئێكەم دەركەفیتن.

* ئێكە ژ دامەزرینەرێن زانكویا دهوك.

* سالا ١٩٩٢ بوویە راگرێ كولیـژا نوژداریـێ لزانكویا دهوك.

* چار ڤەكولین لسەر ڤان بابەتا هەنە.

- كول بوونا كیسكێ زەر (الكیس الصفراء) لكوردسـتانا عیراقێ.

- بەریێت گولچیسكا لباژێرێ دهوك.

- نەساخی و شێنواریێت پەڤینا لپاریزگەها دهوك.

- كرتنـا (الامعـاء الحـاد) دنـاڤ بـەرا نەسـاخێت نەخوشخانێت دهوكێ.

* سەرپەرشـتیا باوەرنـامێت ماجسـتێر كریـە بـو قوتابیێت نوژداریا گشتی.

* پشكداری دڤان كونگرێت زانستیدا كریە.

- كونگرێ نوژداریێ جڤاتـا نوژدارێن عیراقێ لمیسـل سالا ١٩٨٦.

- كونگرێ نەساخێت سەرەتانێ سالا ١٩٨٦ لمیسل.

- كونگرێ جیهانێ چارێ لدور نەبوونا زاروكا (العقم) سالا ١٩٨٩ لفلورنسا - ئیتالیا.

## سەکۆی زانکۆ



# د. محمد احمد الگزنی

## مامۆستا لە کۆلیژی یاساو ڕامیاری

ەسالی ١٩٤٧ لەشاری هەولێر لەگوندی پێمەرەبرە لەدایک بووە.

• لەسەر دەستی باوکی کەنیمامی گوندی گەزنە بوو خوێندوویەتیو هەندێ جاریش لەسەر دەستی قوتابیەکانی باوکی خوێندویەتی.

• لەسالی ١٩٦٥ پەیوەندی بەقوتابخانەی شێخ عبدالقادری گەیلانی لەبەغدا کردووەو لەوێ لەسەر دەستی ژمارەیەک لەزانایان خوێندوویەتی لەوانە شێخ عبدالکریمی مودەڕیسو شێخ عبدالقادری خەتیبو شێخ عبدالله سۆفیو شێخ کمال الدینی طائیو لەسەر دەستی ئەو بەڕێزانە بڕوانامەی زانستی دراوەتێ.

• لەسالی ١٩٧١ پەیوەندی بەکۆلیژی الامام الاعظم بۆ زانستە ئیسلامیەکان کردووەو لەسالی ١٩٧٥-١٩٧٦ بەپلەی زۆر باشە خوێندنی تەواو کردووە.

• لەسالی ١٩٨٢ چۆتە قاهیرەو لەزانکۆی ئەزهەر

لەکۆلیژی یاساو شەریعەت خوێندوویەتیو دوای سێ سال بەپلەی باشترین بروانامەی ماجستێری وەرگرتووەو ناوی خۆی بۆ خوێندنی دکتۆرا تۆمار کردووە.

• لەسالی ١٩٨٩ بەپلەی (الشرف الاولی) بروانامەی دکتۆرای لەسەر نامەی ((نظریة الاستحقاق في الفقه الاسلامي والقانون المدني المصري والعراقي)) وەرگرتووە.

• پێش ئەوەی پەیوەندی بەخوێندنی بالا بکات بۆ ماوەیەک ئیماو خوتبەخوێن بووە بەلام دوای وەرگرتنی بروانامەی دکتۆرا بۆتە سەرپەرشتیاری قوتابخانە ئایینیەکانی ئەمینداریتیی گشتیی ئەوقاف لەناوچەی کوردستان.

• لەسالی ١٩٩٣ بۆتە مامۆستاو هەستاوە بەئیشو کاری راگری کۆلیژی شەریعەتو خوێندنی ئیسلامی لەدهۆک.

• لەکۆتایی سالی ١٩٩٣ گوێزراوەتەوە بۆ کۆلیژی یاساو رامیاری لەزانکۆی سەلاحەدین - هەولێر.

• یاسازانی ئیسلامی (الفقه الاسلامي)و یاسای شارستانی دەلێتەوەو پێش ئێستاش وانەی دەروازەی شەریعەتو باری کەسی دەروازەی یاساو مافە راستینەو رێککەوتنی شارستانی ووتۆتەوە.

• بۆ ماوەیەک سەرۆکایەتی بەشی یاسای پێ سپێردراوە، هەروەها ماوەیەکیش ئیشو کاری راگری کۆلیژی پێ سپێردراوە.

• بەشداری لەچەندین وتوێژی ماستەرنامەی لەهەردوو کۆلیژی یاساو رامیاریو شاداب کردووەو سەرپەرشتی لەسەر چەندین ماستەر نامەش کردووە لەهەردوو کۆلیژی ناوبراو.

• ئەم بەرهەمە بلاوکراوانەی خوارەوەی هەیە:

**بەرهەمە بلاوکراوەکانی:**

١- نظرية الاستحقاق، رسالة دكتوراه وقد اهديت نسخة الى الكتبة.

٢- تقسيم المواريث في الفقة الاسلامي وقانون الاحوال الشخصية، وهذا الكتاب باللغة الكردية بعنوان ((بەشکردنی میرات لەشەریعەتی ئیسلامو یاسا)) وقد طبع سنة ١٩٧٧.

٣- الشيخ نورالدين البريفكاني - حياته اثاره شعره- طبع سنة ١٩٨٣.

٤- حكم زوجات المفقودين في كارثة مايسمى بالانفال وغيرها من الكوارث، مطبوع سنة ١٩٩٦.

الابحاث

٥- غرس ونقل الاعضاء البشرية في الفقة الاسلامي والقانون، مقدم الى مجلة الجامعة.

٦- اثر الحيازة في تملك الثمار في الفقة الاسلامي والقوانين المدنية العراقية والمصرية والفرنسية، مقدم إلى المؤتمر الثالث لجامعة صلاح الدين.

٧- اثر العفو والصلح على عقوبة القتل العمد العدوان في الفقه الاسلامي والقانون العقوبات، مقدم الى مجلة كاروان الاكاديمي.

٨- الحرية وحقوق الانسان في ميزان الاسلام، هذا بحث باللغة الكردية بعنوان ((ئازادیو مافی مرۆڤ لەتەرازووی ئیسلام)) منشور في گۆڤاری یاساپارێزی سنة ١٩٩٦.

التحقيقات والتعليقات

٩- تحقيق كتاب البيوع في الحاوى للماوردى، رسالة ماجستير مطبوع على الالة الكاتبة.

١٠- تحقيق الجزء الاول من كتاب الضمانات للجمالى، مطبوع على الالة الكاتبة.

١١- تعليقات على كتاب نور الاسلام للشيخ عبدالكريم المدرس، مطبوع سنة ١٩٧٨.

١٢- تعليقات على الفرائد الجديدة ومطالع السعيدة للسيوطى مطبوع سنة١٩٧٨.

١٣- تحقيق وتعليقات على رسالة المحذوفات الابن الحاج، مطبوع سنة ١٩٨٥.



سەکۆی زانکۆ

مامۆستای یاریدەدەر
لەکولیژی ئاداب

# عەلی مەحمود جوکل

* لەگوندی گرد مەلا سەر بەناحیەی قوشتەپە سەربە پارێزگای هەلێر لەسالی ١٩٥٠ لەدایک بووە.

* لەسالی ١٩٥٤ هاتوونەتە شاری هەولێرو لەگەرەکی سەیدلوە جێگیر بووە.

* لەسالی ١٩٥٧-١٩٥٨ چووەتە قوتابخانەی سەیدلوە کەدوا تر ناوی گۆرا بە سۆرانی سەرەتایی قۆناغی سەرەتایی هەر لەوێ تەولو کردوە قۆناغی ناوەندی لەکۆماری تەولو کردووە دواتر چوەتە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لەسالی ١٩٦٨-١٩٦٩ دەرچووە دوای سەربازی لە٢٢/٢/١٩٧٦ بەمامۆستای

سەرەتایی لەقوتابخانەی رزگە خۆشناوو دامەزراوە دواتر خۆی گواستووتە قوتابخانەی دیلزی لەناوچەی بالەک.

سالی ١٩٧٩-١٩٨٠ بڕوانامەی ئامادەیی وەک قوتابییەکی دەرەکی بەدەست هێناوە.

*سالی ١٩٨٠-١٩٨١ لەکولێجی ئاداب لەزانکۆی موسل لەبەشی زمانی ئینگلیزی وەرگیراوە کەبەرۆژ لەوێ دەوامی دەکردوو هەموو رۆژ هاتو چۆی کردوەو شەوانەش لەهەولێر مامۆستای سەرەتایی شەوان بووە چونکە مۆلەتی خوێندنی نەبوو لەسالی ١٩٨٣-١٩٨٤ بڕوانامەی بەکالوریوسی وەرگرتووە.

* سالی ١٩٨٤- ١٩٨٥ بووە مامۆستای ناوەندی کاروان دواتر مامۆستایی ئامادەیی رزگاریو دواتریش مامۆستای پەیمانگەی مەلبەندی مامۆستایانی سەرەتایی.

* سالی ١٩٩٢-١٩٩٣ بوە سەرپەرشتیاری پسپۆری زمانی ئینگلیزی.

* لەسالی ١٩٩٦ بڕوانامەی ماستەری لەزمانی ئینگلیزی وەرگرتوە لەنامەی (Asyntactic analysis of Verb Paicle Combination in English and Kurdish: Acontrastive Stuadu).

* لەسالی ١٩٩٧ گواسترایەوە بۆ زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر - کولێجی ئاداب بەشی زمانی ئینگلیزی.

* وانەی Grammar لەبەشی زمان ئینگلیزی دەلێتەوە لەگەل (رێبازی لێکۆلینەوە) لەکولێجی ماف.

* بلاوکراوەکان

١- چەند چیرۆکێک لەگۆڤاری تیشکو نووسەری کوردو رامان بلاوکردۆتەوە.

٢- چەند دەقێکی وەرگێردراو لەگۆڤاری ئەدەبی بیگانەدا.

٣- چەندین گوتار لەرۆژنامە کوردیەکان.






# مامۆستای یاریدەدەر/ حوسێن بالیسانی

+ لەساڵی ١٩٥١ لەشاری هەولێر لەدایک بووە.

+ سەرۆکی بەشی یاسایە لەکۆلیژی ماف.

+ ئەم بڕوانامانەی خوارەوەی هەیە:-

- بەکالۆریۆس لەزانیارییەکانی پۆلیس- کۆلیژی پۆلیس لەبەغدا ساڵی ١٩٧٣.

- بەکالۆریۆس لەفیزیا- کۆلیژی زانستی- زانکۆی موستەنسەریە ساڵی ١٩٧٩.

- بەکالۆریۆس لەیاسا- کۆلیژی یاساو رامیاری- زانکۆی سەلاحەدین ساڵی ١٩٩٢.

- بڕوانامەی ماجستێر لەیاسای سزایی بەپلەی زۆر باشە لەکۆلیژی یاساو رامیاری- زانکۆی سەلاحەدین لەساڵی ١٩٩٦.

+ ماستەرنامەکەی بەناوی (النظرية العامة لجريمة الأمتناع) لێکۆڵینەوەیەکی بەراووردکاری بوو.

+ گەلێک پلەو پایەی لەدەزگا حکومییەکان بینیوە لەوانە:

- ئەفسەری پۆلیس لەساڵی ١٩٧٣.

- تێبین لەبەڕێوەبەرێتییەکانی بەرگری شارستانی.

- مامۆستا.

- بەڕێوەبەر لەگەلێک دەزگای بەرگری شارستانی کە

دواهەمینیان بەڕێوەبەرێتیی بەرگری شارستانی شاری هەولێر بوو.

+ لەساڵی ١٩٧٤ پەیوەندی بەشۆڕشی ئەیلول کردووەو لەدوای ڕێکەوتنی جەزائیر لەساڵی ١٩٧٥ گەڕاوەتەوەو لەسەر میلاکی پۆلیس گوێزراوەتەوە بۆ فەرمانی شارستانیی لەم شارانەی خوارەوە لەباشووری ناوەڕاست و باکووری عیراق فەرمانی بینیوە:

- قادسیە، ئەنبار، دیالە، بەغدا، بەسرە، هەولێر.

+ لە ١٩٩٧/١/١٢ لەسەر میلاکی زانکۆی سەلاحەدین- کۆلیژی یاساو رامیاری وەک مامۆستایەکی یاریدەدەر دەست بەکار بووە.

+ لـــــــــه ١٩٩٧/١١/١٠ گوێزراوەتەوە بۆ کۆلیژی مـافـو بووە بە سەرۆکی بەشی یاسا.

+ خوتبــه خوێنـــی نوێــژی هەینی‌یە لە مزگەوتی گولستان.

**+ ئـەم وانانــەی خـوارەوە دەڵێتەوە:**

- دەروازەیەک بۆ خوێندنـی یاسا/ بەزمانی ئینگلیزی.
- یاســای ســزایی- بەشــی تایبەت.
- بنچینەی زانستی‌ی تاوان.

**+ گـــــه لێک نووســـینو لێکۆڵینەوەی زانستی‌ی هەیـە لەوانە:**

- حق الدفــاع الشـرعی بـين الشريعه والقانون.
- التلقيح الصناعي ورأي الفقـه الاسلامی.
- الجريمة والمقوبة.
- الجريمة السياسـية في القـانون العراقی.

شـایانی باســه بەشـێک لــەو لێکۆڵینەوانەی لـەگۆڤاری دەنگی داو رۆژنامـــەی خـــەبات بـــلاو بۆتەوە.

+ وەک ڕاوێژکـارێکی یاســای ســـزاو یاســـازانی ئیســـلامی لەرۆژنامەو کەناڵـەکانی تەلەفزیۆن بیروڕای لـەبارەی هـەندێ بابـەتی جیاجیای کۆمەلایەتی وەردەگرن.

+ ســەرەڕای کۆلیــژی مــاف ئــەندامی ئەنجومــەنی کۆلیــژی پۆلیسەو وانەبێژیشە تیایدا.

هــەروەها لـــەکۆلیژی یاســاو رامیاریش وانە دەڵێتەوە.

سەكۆی زانكۆ

## سەرۆكی لیژنەی خوێندنی باڵا لەپەرلەمانی كوردستان

# د. ناسح غەفور زەنگەنە



• لە١٩٤٨/٧/١٢ لەشاری كەركوك لەدایك بووە.

• گشت قۆناغەكانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لەشاری كەركوك تەواو كردووە.

• لەسەرەتایی شەستەكان و دوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلول دێتە ریزی پارتی دیموكراتی كوردستان.

• كەلەمێردێكی ماندوونەناس و زەحمەتكێشە و خۆی خۆی پێگەیاندووە تا حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٩ بەكرێكاری و وەستایەتی ژیانی بەسەر بردووە دوابەدوای ئەمەو لەئەنجامی زەبرو زەنگ و توندوتیژی پیاوانی رژێم روو لەسەنگەرەكانی پێشمەرگە دەكات و دەچێتە ریزی لەشكری شۆڕشگێڕی كوردستانەوە.

• لەساڵی ١٩٦٩ یەکەم خولی پەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایانی شۆڕش تەواو دەکات.

• دوای تەواو کردنی خولی پەیمانگەی ناوبراوو لەبەر لێوەشاوەیی دەکرێ بەپشکنەری زانیاری لەقوتابخانەکانی سنوری هەورامان.

• دوای بەیاننامە مێژوویی‌یەکەی یانزەی ئاداری ١٩٧٠ وەک هەڵبژاردەیەکی بارەگای سەرۆک بارزانی لەگەڵ چەند کادیرو مامۆستایانی تری شۆڕشو قوتابیە بەهرەدارەکان بۆ خوێندن بۆ یەکێتی سۆڤیەت ئەنێردرێ.

• ساڵی ١٩٧٠-١٩٧٨ کۆلیژی ئامادەیی بۆ فێربوونی زمانی رووسی‌و چەند وانەیەکی تر لەشاری (ڤارونیژ) بەپلەی باشترین (امتیاز) تەولو ئەکات.

• لەساڵی ١٩٧١ لەزانکۆی (کیڤ) لەپایتەختی ئۆکرانیا لەکۆلیژی پەیوەندی‌یەکانی نێو نەتەوەیی‌و یاسایی نێونەتەوەیی وەردەگیرێو لەساڵی ١٩٧٦ خوێندن تەولو دەکاتو بڕوانامەی ماجستیر لەنامەی (کوردستانو کێشەی کورد لەرێکەوتنو پەیمانە نێو نەتەوەیی‌یەکانی یەکەم چوار یەکی سەدەی بیستەم)) بەپلەی (ممیز) وەردەگرێو هەر لەهەمان ساڵ لەخوێندنی دکتۆرا وەردەگیرێ.

• لەساڵی ١٩٧٩ وتوێژی دکتۆرا نامەکەی (کێشەی کورد لەسیستەمی پەیوەندی‌یەکانی نێونەتەوەیی لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا) دەکاتو بڕوامەی دکتۆرای فەلسەفەی لەمێژووی پەیوەندیەکانی نێونەتەوەیی‌و سیاسەتی دەرەوەی پێ درا.

• لەماوەی خوێندنی لەیەکێتی‌ی سۆڤێتی‌ی پێشوو ئەندامێکی کارامەو لێپرسراوی یەکەمی ڕێکخستنی کیێڤو پاشان هەموو ئۆکرانیاو دواتریش هی گشت یەکێتی‌ی سۆڤێت بووە.

. . . .

• ئەندامێکی چالاکی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا KSSE) بووە.

• دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان ماوەی شەش ساڵ لەبەشو دەزگا جیاجیاکانی مەکتەبی سیاسی پارتی

دیموکراتی کوردستان کاری کردووە.

• لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٨ جارێکی تر ئەگەڕێتەوە بۆ یەکێتی سۆڤیێتو لەمۆسکۆ جێگیر دەبێو لەهۆبەی کێشەی هاوچەرخەکانی کورد لەپەیمانگای رۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی درێژە بەتوژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستیی لەسەر مەسەلەی کورد ئەدا بەمەبەستی خۆ ئامادەکردن بۆ پلەی دکتۆرای زانست بەڵام لەگەڵ راپەرینە مێژووییەکەی بەهاری ١٩٩١و لەسەر داوای سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان پەیمانگە بەجێ دێڵێو دەگەڕێتەوە کوردستانی ئازاد کراو.

• لەماوەی ئامادەبوونیدا لەیەکێتیی سۆڤێت لەنێوان ساڵانی ١٩٨٨ تاکو ١٩٩١ نوێنەری تایبەتی سەرۆک مەسعود بارزانیو کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە لەمۆسکۆ.

• دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان جارێکی تر لەبەشی رێکخستنی مەکتەبی سیاسی پ.د.ک دەست بەکار بۆوەو لێپرسراوێتی دووەمی پێ سپێردرا.

• لەساڵی ١٩٩٧ بووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان.

• لەدامەزرانی یەکەم کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەرکی وەزیری پەروەردەی پێ سپێردراو لەکابینەی دووەمیشدا هەر هەمان ئەرکی جێبەجێ ئەکرد.

• **چالاکییەکانی:**

- بەماوەیەکی کورت بەهاوکاری پسپۆران توانی یاسای وەزارەتی پەروەردە ئامادە بکات.

- لەماوەی دەست بەکاربوونیدا لەپلەی وەزیری پەروەردە دوو پەیمانگەی مەڵبەندی ماموٚتایانی لەسلێمانیو دهۆک کردەوە. هەروەها دوو پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی لەسلێمانیو دهۆک کردەوە.

- چالاکانە پشتگیری کردووە لەکردنەوەی زانکۆی دهۆکو سلێمانی.

- لەمانگی ١٩٩٤/١١ تاکو ئێستا ئەندامی پەرلەمانی کوردستانەو ئێستاش سەرۆکی لیژنەی خوێندنی باڵایە

لەپەرلەمانو ئەندامی لیژنەی پەیوەندیەکانی پەرلەمانو ئەندامی لیژنەی کاتی دەرکراوەکانە.

- لەکۆلیژی ئاداب - بەشی مێژوو لەزانکۆی سەلاحەددین وانەی وتۆتەوەو نیازیش وایە لەکۆلیژی ماف _ ئێواران وانە بلێتەوە.

- بەڕێوەبەری پەیمانگەی کادیرانی پارتی دیموکراتی کوردستانە.

* بەرهەمە بلاوکراوەکانی:

- دەیان وتارو لێکۆلینەوەو لێدوانی لەئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراقو رۆژنامەی خەباتو باوە گوڕ گوڕو ئەزمیرو دەنگو باسی کوردستان بلاوکردۆتەوە.

- کێشەی کورد لە رێکەوتنو پەیمانە نێو نەتەوەیی یەکانی یەکەم چواریەکی سەدەی بیستەم - نامەی ماجستیر بەزمانی رووسی.

-کێشەی کورد لەسیستەمی پەیوەندیەکانی نێونەتەوەیی لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا، نامەی دکتۆرا بەزمانی روسی.

- کێشەی کورد لەپەیمانی سیڤر سالی ١٩٢٠ - کییف - ١٩٧٨ بەزمانی روسی.

- کێشەی کورد ئەمرۆو رۆلو جێی پارتی دیموکراتی کوردستان لەزووتنەوەی رزگاری خوازی کورددا - مۆسکۆ - ١٩٩٠ بەزمانی روسی.

- دارمانو نەمانی یەکێتی سۆڤیت - هۆکارو ئاکامەکانی - پیرمام ١٩٩٢ لەگۆڤاری کادیر ژمارە (٢٩) بەکوردی بلاوبۆتەوە.

- چەند لاپەرەیەکی پێویست لەسەر بیرو بۆ چوونی سۆشیال دیموکراتەکان - لولان - ١٩٨٢ لەچاپخانەی خەبات چاپ کراوە.

- سەرەتا گرنگەکانی رێکخستنی پارتایەتی - رازان - ١٩٨٤ لەچاپخانەی خەبات چاپکراوە.

- رێگای کۆلنەدان لەسالی ١٩٨٦ لەچاپخانەی خەبات چاپ کراوە.

- کێن ئەوانەی شۆڕشگێڕن - کۆمەلە ووتارێکەو لەسالانی ١٩٨٢ - ١٩٨٤ لەئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق بەخش کراوە

## سەکۆی زانکۆ



# م. جمال محمد عزت

### سەرۆکی
### بەشی ژمێریاری- کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابووری لەزانکۆی سەلاحەدین

• لەساڵی ١٩٤٧ لەقەڵاتی هەولێر لەدایك بووە.

• خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی هەر لەشاری هەولێر تەواو کردووە.

• لەساڵی ١٩٦٩ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بازرگانی لەکۆلێژی بازرگانی لەزانکۆی بەغدا وەرگرتووە.

• هەر لەساڵی ١٩٦٩ بەشداری خولێکی پراکتیکی لەدیوانی چاودێری دارایی لەبەغدا بۆماوەی پێنج مانگ کردووە.

• بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٧٠ لەدیوانی چاودێری دارایی بەفەرمانی (مدقق حسابات) دامەزراوە.

• لەساڵی ١٩٧٤ دووساڵ تەقویمی لەبواری زانستی ژمێریاری خوێندویەتی و پلەی ژمێریاری یاسایی لەبەر سەرکەوتنیدا لەم خوێندنەدا پێ بەخشراوە.

• دەیان فەرمانی لەدام و دەزگا رەسمی یەکانی وولات بینیوە لەگەلێك بواری جیاجیادا لەوانە لەسەر داخوازی ئەمینداری گشتی ئابووری و دارایی گوێزراوەتەوە بۆ دیوانی ئەمیندارێتی و فەرمانی بەڕێوەبەری پشکنینی دارایی پێ سپێردراوە تا ساڵی ١٩٨٩ کە لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە.

• لەساڵی ١٩٩٣ لەسەر داخوازی ڕاگری کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابووری بۆ فەرمان گەڕاوەتەوە و وەك مامۆستایەکی یاریدەدەر لەبەشی ژمێریاری دەست بەکار بووە.

• لەساڵی ١٩٩٤ کراوەتە بەڕێوەبەری بەشی دارایی لەسەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین.

• لەساڵی ١٩٩٥ کراوە بە یاریدەدەری ڕاگری کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابووری.

• لەنێوان ساڵی ١٩٩٥/١٩٩٦ کراوەتە بریکاری ڕاگری کۆلێژ بەهۆی شەهید بوونی ڕاگری کۆلێژەکە.

• ئەم لێکۆڵینەوانەی خوارەوە ئامادەیە بۆ بڵاوکردنەوە:

- دراسة النظام الحسابي لصندوق توفير البريد ١٩٧٤.
- السماحات الضريبية في ظل التضخم الاقتصادي ١٩٩٥.
- تدقيق حسابات المصارف التجارية ١٩٩٦.

• ئەم وانانەی خوارەوەی گوتۆتەوە:

- التدقيق والرقابة المالية.
- النظام الحاسبي الموحد.
- المحاسبة المتخصصة.
- المحاسبة الضريبية.
- نظم المعلومات المحاسبية.
- المحاسبة المتوسطة.
- مبادىء المحاسبة باللغة العربية.
- مبادىء المحاسبة باللغة الانكليزية.



## سەکۆی زانکۆ

# مامۆستا ئیسماعیل موسی مراد

* لەدایک بووی (١٩٥٢).
* لەساڵی ١٩٧٥ بەکالۆریۆسی فیزیایی لەزانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
* لەساڵی ١٩٨٢ ماجستێری فیزیای فەلەکی لەزانکۆی مانجستەر لەئینگلترا وەرگرتووە.
* **پلەی زانستی مامۆستا.**
* لەماوەی ١٩٧٧ تا ١٩٨٠ وەکو یاریدەدەرێکی فیزیاوی لەکۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سلێمانی کاری کردوە.
* لەماوەی ١٩٨٣ تا ١٩٩٤ ئەو وانانەی وتۆتەوە.

(ئەندازەی ڕووناکی، ڕووناکی فیزیای، فیزیای گشتی، فەلەک، دەنگو جوولەی مەوجی، کارەباو موگناتیسی).

هەر لەو ماوەیەدا سەرپەرشتی تاقیگەکانی کردوە.

ئەو لێکۆڵینەوەو توێژینەوانەی بلاوکراونەتەوە ئەمانەن:

1-ANALYSIS OF INFRARED PHOTOMETRY OF ALGOL ASTROPHYSICS AND SPACE SCIENCE 98 (1984) PP(163-169).

2- THE EFFECT OF RADIATION ON DEVELOPMENT AND INFECTIVITY OF TRYPANOSOMA EVANSI IN WHITE MICE.

3- THE ECLIPSNG BINARY SYSTEM DM PER.
THE OBSERVATOY VOL.104 NO:1059 (PP 83-88).
4- PHOTOELCTRIC OBSERRATION OF MT HER COMMISSION 27 OF THE I.A.U INFORMTION BULLETIN ON VARIABLE STARS
1982-OCTOBER 13
KONKOLY OBSRRATORY
BUDAPEST.
5- OBSERATION AND ANALYSIS OF MT HER ASTROPHYSICS AND SPACE SCIENCE 153: PP (335-34)1989.

٦- الخصائص الحرارية للبلورة الادارية للمركب الشبه الموصل الثلاثي CUGE P (مجلة جامعة الصلاح الدين-١٩٩٢- المجلة٤، العدد٤).
٧- علاقات اللادقة في تمثيل المتغيرات الفضاء الطوري للميكانيك الكمي. (المجلة العلمية لجامعة صلاح الدين-١٩٩٢- المجلة ٥ العدد٢).

*** هەروەها ئەم کتێبانەی بلاوکراونەتەوەو لەتەواو بوون.**

١- بوونەوەرە هۆشمەندەکانی بۆشایی ئاسمان بەزمانی کوردی.
٢- ئەو پەرتووکانەی کەلەتەواو بوون دایە:
أ- الاطباق الطائرة ماضيها، وحاضرها ومستقبلها).
ب- ئەوانەی خەلاتی نۆبلیان وەرگرتووە لەفیزیا تا ساڵی ١٩٩٣.
جـ- دينامكية الشفق القطبي.
د- عودة الكرة الثلجية الملتوية.
هـ- توظيف التقنيات العملية في خدمة الاحتمالات الفكلية.

ئەو کۆنگرەو کۆڕانەی بەشداری تیاکردووە.

١- بەشداری کردن لەکۆڕی زانستی لەمەڕ زیندووکردنەوەی کەلەپووری گەردوون زانی ئیسلامی کەلەئەنجومەنی توێژینەوە لەساڵی ١٩٨٨ لەبەغدا ساز کرا.

٢- بەشداری کردن لەهەڵسەنگاندنی توێژینەوەکانی قوتابیانی بەشی فیزیا لەماوەی ١٩٨٦ تا ١٩٨٨.

پسپۆری کارگێری لە١٩٨٥ تا ١٩٩٣ بڕیاردەری بەشی فیزیا بووە. ئەندامی لیژنەی تەرقیاتی زانستی لە(١٩٩٠-١٩٩٣)وتائێستا سەرۆکی بەشی فیزیای کۆلیژی پەروەردەیە.

هەرێمی کوردستان
ژمارە (٤٢) دووشەممە ١٩٩٧/١/٢٠ ٢٦٩٦ کوردی

سەکۆی زانکۆ

# پرۆفیسۆری یاریدەدەر ئەحمەد چاوشین



لەسەرەتای سالانی هەشتادا کۆلیجی ئابووری و بەڕێوەبردن لەزانکۆی سەلاحەدین بەدەولەمەندترین کۆلێژی ئەم زانکۆیە دەژمێردرا لەرووی ژمارەی پسپۆران و قوتابیانەوە. بەلام دوابەدوای کردنەوەی پسپۆران و قوتابیانەوە. بەلام دوابەدوای کردنەوەی کۆلێژی یاساو ڕامیاری هەندێ لەمامۆستایانی ئەم کۆلێژە گوێزرانەوە بۆ ئەوێ و بۆشاییەکیان لەجێی خۆیان بەجێ هێشت هەرچەندە نەبووە هۆی ئیفلیج بوونی ئەم کۆلێژە بەلام دوابەدوای شەهیدکردنی دکتۆر محمد قەرەداغی دەتوانین بلێین چرای ئەم کۆلێژە کوژایەوە ئەویش بەوەی کەزۆربەی مامۆستاو پسپۆرانی ی بەرەو هەندەران کۆچیان کرد بەلام سەرەرای ئەمەش هەندێ زانای لەخۆبووردو گیان

لەسەردەست توانیان درێژە بەخەباتی بێ ووچانی زانستی یان بدەن و نەیەلن ئەم کۆلێژە دێرینە لەخزمەتکردن بووەستێت کەمامۆستای پایەبەرزو پرۆفیسۆری یاریدەدەر ئەحمەد چاوشین یەکێکە لەهەرە دیارەکانی ئەم کۆلێژەو پسپۆرێکی کارامەو لەخۆبووردوی بواری ئابووری یە لەکوردستاندا. ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەژیاننامەی زانستی ی و کارگێری یەکەی.

- ناوی تەولوی احمد فیض الله چاوشینە.
- لەسالی ١٩٤١ لەشارۆچکەی پردێ لەدایك بووە
- نیشتنگەی هەمیشەیی گوندی دووگردکانی سەربەشاری هەولێرە.

• قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە شاری کەرکوک تەواوکردووە.
• بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زانیاری ئابووریی لە زانکۆی ئوکلاهوما، نورمن لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەدەست هێناوە.
• گەلێک بڕوانامەی تری وەدەست هێناوە لە بوارەکانی زمان و کولفەو ژمێریاری و زانیاریی یە سروشتی یەکان و ماتماتیک لە کۆمەڵەی هونەری پاشایەتی لە شاری لەندەن لە ئینگلستان، هەروەها لە زانکۆی کیمبرج لە ئینگلستان هەروەها بڕوانامەی لە بواری پەیوەندی یە گشتی یەکان لە زانکۆی اسکرانتون/ پنسلڤانیا لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەدەست هێناوە.
• ئەم بەرهەمە بڵاوکراوانەی خوارەوەی هەیە:
ـ کتێبی «الاقتصاد الجزئي التحليلي» لە ژێر چاپدایە.
ـ کتێبی «النظرية الاقتصادية» سالی ۱۹۹۰ لە چاپخانەی زانکۆ چاپ کراوە.
ـ دە توێژینەوەی زانستیی هەندێکیان بڵاوکرانەتەوەو هەندێکی تریش پەسند کراون بۆ بڵاوکردنەوە.

ـ سەرپەرشتی لەسەر سێ ماستەرنامە کردووە.
• گەلێک فەرمانی جۆراوجۆری لە دام و دەزگاکانی دەوڵەت بینیوەو لە ماوەی خزمەت کردنیدا چەندین جار تووشی گرتن و بەندی نشین کردن بووە لەسەر بیروباوەری نەتەوایەتی و زۆرجاران بە زۆری لە دەزگایەکەوە بۆ دەزگایەکی تری خزمەت گوزاری گوێزراوەتەوە بەتایبەتی لە بواری زانکۆدا.
• لە سالانی ۱۹۷٤ـ۱۹۷٥ بەشداری بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردیی کردووە.

هەریمی کوردستان

ژمارە (٤١) دووشەممە ١٩٩٧/١/١٣ ٢٦٩٦ کوردی



سەرکۆی زانکۆ

# د. فاروق عبداللە کریم

هەرچەندە تەمەنی زانستی و کارگێری دکتۆر فاروق عبداللە کریم زۆر درێژ نی یە بەلام سەرەرای ئەمەش دەتوانین بڵێین رۆڵێکی بەرچاوی لەم ماوەیەدا لەبواری زانکۆدا بینیوە بەتایبەتی لەکۆلیژی یاساو رامیاری دا.

ئەوەی شایەنی باسە، ئەم زاتە بەرێزە هەردوو بروانامەی ماجستێرو دکتۆرای لەزانکۆی بەغدا بەپلەی (امتیاز) وەرگرتووەو بەیەکێک لەمامۆستا زیرەك و کارامەی ئەو کۆلیژە دادەندرێت هەر لەبەر ئەمەش لەکاتێکی زۆر نزیکدا لێپرسراوێتی ی بەشی یاساو لیژنەی خوێندنی باڵای لەکۆلیژی یاساو رامیاری ی پێ سپێردراوە سەرەرای هەڵسانی بەیاریدەدەری راگری کۆلیژی مافی نێواران بۆ ماوەیەك، ئەمەی خوارەوە ژیاننامەی زانستی ی و کارگێری یەکەیەتی:

• لەساڵی ١٩٦٠ لەشاری سلێمانی لەدایك بووە.

• لە ١٩٩٢/٩/٢١ بۆ یەکەم جار لەزانکۆی سەلاحەدین دامەزراوە.

• ئەم بروانامانەی خوارەوەی هەیە:

١ـ بروانامەی بەکالۆریۆس لەشەریعەتدا ساڵی ١٩٨٢/١٩٨٣ کۆلیژی شەریعەت ـ زانکۆی بەغدا.

٢ـ بروانامەی ماجستێر لەشەریعەتدا لەساڵی ١٩٩٠ لەکۆلیژی شەریعەت ـ زانکۆی بەغدا.

٣ـ بڕوانامەی دکتوراه لە زانستە ئیسلامییەکان لە کۆلیژی زانستە ئیسلامییەکان (كلية العلوم الاسلامية) – زانکۆی بەغدا ساڵی ١٩٩٥..

• تاکو ئێستا ئەم فەرمانانەی خوارەوەی بینیوە:

– مامۆستای یاریدەدەر لە ڕۆژی دامەزرانییەوە تاکو ١٩٩٥/١٠/٧.

– مامۆستا تاکو ئێستا.

– سەرۆکی بەشی یاسا بەوەکالەت لە کۆلیژی یاساو ڕامیاری لە ١٩٩٥/١١/١٥ تاکو ئێستا.

– سەرۆکی بەشی زانستە سیاسیەکان بەوەکالەت لە ١٩٩٦/٤/١٥ تاکو ١٩٩٦/٩/١٥.

– بریکاری ڕاگری کۆلیژی یاساو ڕامیاری لە ١٩٩٦/٦/١ تاکو ١٩٩٦/٦/٨.

– یاریدەدەری ڕاگری کۆلیژی مافی ئێواران لە ٣/١ تاکو ١٩٩٦/٧/١.

– سەرۆکی لیژنەی تاقی کردنەوەی توانای وانە ووتنەوە لە کۆلیژی یاساو ڕامیاری لە ١٩٩٥/١٢/٧ وە تاکو ئێستا.

• ئەم نامەو توێژینەوانەی خوارەوەی هەیە:ـ (الضرر المعنوي و تعويضه في الفقة الاسلامي) لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە لەنێوان شەریعەت و یاسادا ماستەر نامەیە بەسەرپەرشتی دکتۆر هاشم جمیل عبدالله ئامادەکراوەو پێشکەش بە کۆلیژی شەریعەتی زانکۆی بەغدا کراوەو بە پلەی (امتیاز) پەسەند کراوەو ٩٥٪ پلەی دراوەتێ و بە یەکەم نامەی خولەکەی خۆی داندراوە.

ـ (الاستحسان ونماذج من تطبيقاته في الفقة الاسلامي) لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە، نامەی دکتۆرایە بەسەرپەرشتی پرۆفیسۆر دکتۆر هاشم جمیل عبدالله ئامادەکراوەو پێشکەش بە کۆلیژی زانستەکانی ئیسلامی زانکۆی بەغدا کراوەو بە پلەی (امتیاز) پەسەند کراوەو ٩٧٪ پلەی دراوەتێ و بە یەکەم نامەی خولەکەی خۆی لەقەڵەم دراوە.

ـ (الديمقراطية في الاسلام اساسها وابرز مظاهرها) لێکۆڵینەوەیەکە لەسیمینارێکی زانستی ی کەبەشی زانستە سیاسیەکانی کۆلیژی یاساو رامیاری پێ ی هەڵساوە پێشکەش کراوە وەخەڵاتی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

ـ (الناسخ والمنسوخ في الحديث) بڵاونەکراوەتەوە.

ـ (مقارنات موجزة بين الشريعة والقانون) بڵاونەکراوەتەوە.

• تاکو ئێستا لەکۆلیژی یاساو رامیاریو کۆلیژی مافی ئێوارانو کۆلیژی ئاداب ئەم وانانەی خوارەوەی ووتۆتەوە:

ـ المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية.

ـ اصول الفقه الاسلامي.

ـ قانون الاحوال الشخصية.

ـ النظام السياسي في الاسلام.

• ئەندامی لیژنەی ووتوێژی ماستەرنامەی یاسا «عقد الدلالة» بووە.

هەرێمی کوردستان

ژمارە (٩١) دووشەممە ١٩٩٧/٣/٣ ـ ٢٦٩٦ کوردی

## سەکۆی زانکۆ

# پرۆفیسۆری یاریدەدەر عبدالحمید یعقوب جبرائیل



زمانە جیهانی یەکان بایەخێکی گرنگیان هەیە لەبواری زانکۆو دیراساتی ئەکادیمیادا وەلەسەرووی ئەو زمانە جیهانیانەوە زمانی ئینگلیزی دێت، بۆیە راستیان گوتووە کەهەر مامۆستایەکی زانکۆ ئەگەر یەکێك لەزمانە جیهانی یە سەرەکی یەکان نەزانێت بەمامۆستایەکی سەرکەوتوو لەم بوارەدا دانانرێ هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کەلەزانکۆکانی عیراقدا بۆ ئامادەکردنی نامەی ماجستێر یان دکتۆرا دەبێ بەلانی کەمی یەوە ئاماژە بەسێ سەرچاوەی بیانی بکرێت ئینجا نامەکە پەسند دەکرێت. بەم پێ یە دەتوانین بڵێین بەشی زمانی ئینگلیزی لەکۆلیژی ئادابدا زیندووترین بەشەو هەمیشە پاڵپشتێك بووە بۆ پێگەیاندنی کادیران و پسپۆران و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریی بێگانە لەنێو کۆمەڵدا

لەراستیدا ئەم بەشە لەلایەن نوخبەیەکەوە بەرێك و پێکی بەرێوە دەچێ کەپرۆفیسۆری یاریدەدەر عبدالحمید یعقوب یەکێکە لەو بەرێزانەو رۆڵی بەرچاوی هەبووەو توانیویەتی بەشێکی گەورەی ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کەشەهیدی زانکۆ عبدالقادر فەرهادی لەو کۆلیژەدا لەدوای خۆی بەجێی هێشتبووو ئێستاش سەرۆکی ئەو بەشەیە.

**ئەمەی خوارەوە بەشێکە لە ژیاننامەی زانستی و کارگێڕیی ئەم زاتە بەڕێزە:**

• لەساڵی ١٩٤١ لەشاری شەقڵاوە لەدایك بووەو خوێندنی سەرەتایی هەر لەوێ تەواوکردووە.

• خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لەشاری هەولێر تەواو کردووە.

• لەساڵی ١٩٦٣ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بەپلەی (ئیمتیاز) لەبەشی ئینگلیزی کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی بەغدا وەرگرتووەو هەر لەهەمان ساڵدا لەئامادەیی هەولێر دامەزراوە.

• لەساڵی ١٩٧٧ لەخولی (القادة التربويين) بەپلەی دووەم لەکۆی سەد مامۆستای وانەی ئینگلیزی لێهاتوو لەسەر ئاستی عێراق دەرچووە.

• لەساڵی ١٩٨٠ بەزەمالەی ئەنجومەنی ڕۆشنبیریی بەریتانی بۆ خوێندنی ماجستێر چۆتە بەریتانیاو بڕوانامەی ماجستێری لەزانکۆی نورث ویلزی بەریتانیا، لەنامەی «فۆنۆلۆجی زمانی سریانی وتراو ـ The Segmental System and Syllable Structure of Spoken Iraqi Syriac) وەرگرتووە.

• دوای گەڕانەوەی لەبەریتانیا بۆتە سەرۆکی بەشی ئینگلیزی لەپەیمانگای مامۆستایانی هەولێر.

• لەساڵی ١٩٨٥ گواستراوەتەوە بۆ کۆلێژی ئاداب لەزانکۆی سەلاحەدین و وانەی (اللغة الانكليزية للاغراض العلمية) و (اللغة الانكليزية العامة)ی وتۆتەوە لەکۆلێژی پزیشکی و ئەندازیاری و یاساو زانست و کشتوکاڵ و پەروەردەو بەڕێوەبردن و ئابووری.

• لەساڵی ١٩٨٦ نوێنەری زانکۆی سەلاحەدین بووە لەکۆنگرەی زانستی دووهەمی زانکۆی موسڵ و لێکۆڵینەوەیەکی بەناونیشانی Teaching English to Non-Departmental MSC. and MA Students (Syllabuses and Teaching Techniques) پێشکەش کردووە.

• لەساڵی ١٩٩٠ نێردراوە بۆ بەریتانیا بۆ بەشداریکردن لەسمینارەکانی پەرەپێدانی پسپۆری مامۆستایانی ئینگلیزی لەزانکۆکانی ئۆکسفۆردو کێمبرج و اسکس و نوتینگهام و لەندەن.

• لەساڵی ١٩٩١ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەری دراوەتێ .

• لەکۆتایی ساڵی ١٩٩٦ نامەی دکتۆرای تەواو کردووەو بەناونیشانی « لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری پراکتیکی فۆنیمە ریزبووەکانی زمانی ئینگلیزیو کوردی ــ An Applied Contrastive Study of English and Kurdish Segmental System and Structure».

ئێستاش چاوەڕوانی وتوێژی نامەیەکە لەئایندەیەکی نزیکدا .

• تاکو ئێستا زیاتر لەبیست لێکۆڵینەوەی زانستیی ئەنجام داوە ئەمەی خوارەوە ناونیشانی هەندێك لەو لێکۆڵینەوانەن کەبڵاوکراونەتەوە :

* Dialogues are Effictive Means to Promote the Speaking Skill. English Consonantal Diffoculties Encountered by Kurdish Learners of English.

*On Teaching English Pronunciation in the Primary Stage.

* On Teaching English Grammar in the Intermediate Stage.

* On Teaching English Vocabulary in the Post-Intermadiat Stage.

* Kurdish Velar Plosives and Palato-Alveolar Affricates Related.

* Velarisation in Kurdish.

• ئەمەی خوارەوە ناوی هەندێك لەو لێکۆلینەوانەن کەبۆ بڵاوکردنەوە ئامادەنو لەلایەن لیژنەی زانستییەوە پەسندکراون :

* English Vocalic Difficulties for Kurdish Speakers.

* Assimilation and Elision in Kurdish.

* Pharyngealistion in Spoken Syriac.

* Oppositeness of Meaning.

* Polysemy.

** ئەم بەرهەمە چاپکراوانەی خوارەوەی هەیە:

• وەرگێرانی کتێبی (الشخصية والتربية) لەلایەن دیڤید فۆنتانا بۆ زمانی عەرەبی لەگەڵ دکتۆر صلاح نوری داود (١٩٨٩)PERSONALITY AND EDUCATION BY DAVID FONTANA .

• وەرگێرانی کتێبی (زمانەوانی چی یە؟) لەلایەن دیڤید کریستال بۆ زمانی کوردی لەگەڵ مامۆستا یوسف شەریف و مامۆستا حسێن علی (١٩٩٣). WHAT IS LINGUISTICS? BY DAVID CRYSTAL.

• دانانی (فەرهەنگی زاراوەکان ئینگلیزی ـ کوردی) لەگەڵ مامۆستا یوسف شەریف (١٩٩٤) DICTIONARY OF IDIOMS (ENGLISH-KURDISH).

• دانانی فەرهەنگی (العبارات الاصطلاحية والاقوال المأثورة عربي ـ انكليزي) بەهاوبەشی لەگەڵ مامۆستا وریا عزالدین ١٩٩٠.

A DICTIONARY OF IDIOMSAND PROVERBS (ARABIC- ENGLISH) .

• سەرپەرشتی ئەم ماستەرنامانەی خوارەوە لەبەشی ئینگلیزی کردووە:

* ADJECTEVAL SEQUENCE IN ENGLISH AND KURDISH.

* A SURVEY OF KURDISH WOMEN'S LINGUISTIC STYLE AND SPEECH STRATEGIES IN ARBIL.

* THE IMPERATIVE IN ENGLISH AND KURDISH: A CONSTRASTIVE STUDY.

* A SYNTACTIC ANALYSIS OF VERB PARTICLE COMBINATIONS IN ENGLISH AND AND KURDISH: A CONTRASTIVE STUDY.

• بەشداری وتووێژی چەندین ماستەرنامەی لەبەشی ئینگلیزی و کوردی کردووە.

• وانەی ئینگلیزی بەقوتابیانی خوێندنی باڵا (ماجستێرو دکتۆرا) لەزانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر دەڵێتەوە.



سەکۆی زانکۆ

# مامۆستای یاریدەدەر

# شێرزاد عەزیز تەها

* لەساڵی ١٩٦٥- لەهەولێر لەدایک بووە.

* لەساڵی ١٩٨٧-١٩٨٨ بەشی فیزیای کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدینی تەواو کردوەو بروانامەی بەکالۆریۆسی وەرگرتووە.

* لەساڵی ١٩٩٠ وەکو معید لەبەشی فیزیادا کاری کردوە.

* لەساڵی ١٩٩٣ لەبەشی فیزیای کۆلیژی زانستی زانکۆی سەلاحەدین بڕوانامەی ماجستێری وەرگرتووە کەلەژێر ناوی (نیمچە گەیەنەرەکان- أشباه الموصلات) بووە.

* لەساڵی ١٩٩٣ەوە وەکو مامۆستای یاریدەدەر لەبەشی فیزیای کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر کار دەکا تائێستاش ئەم وانانەی ووتۆتەوە.

- میکانیک، کارەبا، فیزیای گشتی:

* لەتاقیگەکانیش ئەم وانانەی ووتۆتەوە:

* سیفەتەکانی مادده.

* کارەبای سەرەتا (کهربائیة المبتدی).

* کارەبای پێشکەوتوو (کهربائیة المتقدم).

* تاقیگەی گشتی.

* ئەم لێکۆڵینەوەو توێژینەوانەی سازداوە.

* دراسة الامتصاص البصري DGC للزجاج $V_2O_5$-$TeO_2$.

* المعالجة الحرارية لشضايا الانتظار في كاشف الزجاج من نوع جيد الصودا العراقي.

* دراسة الامتصاص البصري ولكثافة النسبية للزجاج $NO_2B_4\%_7$-$V_2O_5$-Nio.

* وەرگێڕانی کتێبێکی زانستی بواری فیزیا لەگەڵ چەند مامۆستایەک.

# سەکۆی زانکۆ



ژیاننامەی زانستیو کارگێڕیی پرۆفیسۆری یاریدەدەر **جبار صابر طه** مامۆستای ئەمجارەمان یەکێکە لەکۆنترین مامۆستای کۆلێژی یاساو رامیاری لەزانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر کەهەر لەسەرەتای دامەزرانی ئەم کۆلێژەوە شان بەشانی راگری کۆلیژ توانی درێژە بەخەباتی زانستیی خۆی لەم کۆلێژەدا بدات وەیەکێکە لەدامەزرێنەرە هەرە دیارەکانی کۆلیژی ماف ـ ئیواران کەلەسەرەتای دامەزراندنییەوە تاوەکو ناوەراستی ساڵی ١٩٩٥ راگری بووە ئەمەی خوارەوەش بەشێکە لەژیاننامەی زانستیو کارگێری ئەم مامۆستا بەرێزە:

**• ئەم بروانامەی خوارەوەی هەیە :ـ**

١ـ بەکالۆریۆسی یاسا لەزانکۆی مستنصریە لەساڵی ١٩٧٦.

٢ـ ماستەرنامە لەیاسای تایبەتیدا لەزانکۆی بەغدا لەساڵی ١٩٧٩.

• لە ١٩٧٩/١٠/١ بۆ یەکەم جار بەناوونیشانی مامۆستای یاریدەدەر لەسەر میلاکی ئامۆژگای تەکنیکی لەشاری سلێمانی دامەزراوە.

• لە ١٩٨١/٩/١٧ گوێزراوەتەوە بۆ ئامۆژگای کارگێریی لەکەرخ.

• لە ١٩٨٢/١/٢٦ بەناوونیشانی مامۆستای یاریدەدەر لەزانکۆی سەلاحەدین کۆلیژی کارگێریو ئابووری دامەزراوە.

• لە ١٩٨٦/٧/٦ ناوونیشانی گۆڕاوە بۆ مامۆستا.

لە ١٩/٥/١٩٨٦ ناونیشانی گۆڕاوە بۆ پرۆفیسۆری یاریدەدەر.

لە ١٥/٩/١٩٩٢ بووە بەراگری كۆلێژی ماف _ ئێواران.

* لەقۆناغەكانی خوێندنی بەكالۆریۆس ئەم وانانەی خوارەوەی وتۆتەوە:_

١_ المرافعات المدنيّة، ٢_ الاثبات، ٣_ العقود، ٤_ القانون الدولي الخاص، ٥_ قانون العقوبات/ القسم العام.

هەروەها وانەی «القانون الجنائي» بەقوتابیانی خوێندنی بالا دەڵێتەوە.

* ئەم نووسراوو بلاوكراوە زانستییانەی خوارەوەی هەیە:_

١_ النظام القانوني لعقد الحساب الجاري وتطبيقاته المصرفية.
٢_ مبدأ عدم رجعية القوانين والاستثناءات الواردة عليه.
٣_ تنازع القوانين من حيث المكان في القانون الخاص العراقي.
٤_ فكرة العدالة في القوانين العراقية القديمة.
٥_ سبب التنفيذ في سند التنفيذ.
٦_ نظام الشخصية المعنوية للشركة في قانون الشركات العراقي الجديد.
٧_ الدور المتميز للجامعات في تنمية المجتمع.
٨_ المدخل لدراسة القانون.
٩_ احكام القانون التنفيذ.
١٠_ احكام الحساب الجاري.
١١_ اقامة المسؤولية المدنية عن العمل غير المشروع على عنصر الضرر.
١٢_ احكام حق الزوج في تأديب زوجته في الشريعة الاسلامية والقانون.
١٣_ الوجيز في القانون الدولي الخاص.

* تاكو ئێستا سەرپەرشتی لەسەر دوو ماستەرنامە لەبواری یاسادا كردووە:

١_ علاقة السببية في القانون الجنائي.
٢_ النظرية العامة لجريمة الامتناع.

## سەرۆکی زانکۆ



## د. اکرم احمد البرزنجی

سەرۆکی بەشی عەرەبی کۆلێژی ئاداب

- لەساڵی ١٩٥٠ لەشاری هەولێر لەدایک بووە

قۆناغەکانی خوێندن:

- لەساڵی ١٩٦٣ قوتابخانەی ئابینی سەرەتایی تەواو کردووە.

- لەساڵی ١٩٦٦ خوێندنی ناوەندی لە ناوەندی هەولێری کوڕان تەواو کردووە.

- لەساڵی ١٩٧٢ خوێندنی ئامادەیی لە ئامادەیی المستقبل المسائیە لەهەولێر تەواو کردووە

- لەساڵی ١٩٧٣ پەیمانگای ئیسلامی لە کۆیە تەواو کردووە.

- لەساڵی ١٩٨٠ بەکالۆریۆسی لەزمانی عەرەبی لە زانکۆی موسل وەرگرتووە.

- لەساڵی ١٩٨٩ ماجستیری لەزمانی عەرەبی لەزانکۆی موسل وەرگرتووە.

- لەساڵی ١٩٩٥ بڕوانامەی دکتۆرای لەزمانی عەرەبی لەزانکۆی موسل وەرگرتووە.

* ئەمەی خوارەوە ناونیشانی ماستەر نامەو دکتۆرانامە کانیەتی:

- ماستەر نامە: ألفاظ العبادات في القرآن الكريم
- دکتۆرانامە: الفاظ المعاملات في القرآن الكريم

* پلەی زانستی:

- مامۆستا

* ئەم فەرمانانەی خوارەوەی بینیوە:

- خوتبە خوێنو ڕابەری ئاینی لەوەزارەتی ئەوقاف لەساڵی ١٩٧٣.
- پشکنەری گشتی لەدیوانی ئەمینداریتیی گشتیی ئەوقاف لەساڵی ١٩٧٥.
- ئیمامو خوتبە خوێن لەشاری هەولێرو موسڵو لەنێوان ساڵانی (١٩٧١-١٩٨٠)
- سەرۆکی بەشی زمانی عەرەبی لەکۆلێژی ئاداب زانکۆی سەلاحەدین لەساڵی ١٩٩٥ تاوەکو ئێستا.

* ئێستا قوتابی پۆلی یەکەمی کۆلێژی مافی ئێوارانە بەهیوای وەرگرتنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە یاسا.

## سەکۆی زانکۆ



# پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. ئازاد توفیق فیض الله

• لەساڵی ١٩٥٣ لەشاری سلێمانی لەدایك بووە.

• خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لەشاری سلێمانی تەواو کردووە.

• لە ١٩٧٦/٦/٢٦ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەپسپۆری کیمیا لەزانکۆی سلێمانی بەدەست هێناوە.

• لەساڵی ١٩٧٨ بڕوانامەی ماجستێری لەکیمیای شیکردنەوە لەزانکۆی سلێمانی وەرگرتووە.

• لەساڵی ١٩٨٥ بڕوانامەی دکتۆرای لەفەلسەفەی کیمیای شیکردنەوە لەزانکۆی (هەڵ) لەبەریتانیا وەرگرتووە.

• بۆ یەکەم جار بەپلەی زانستی مامۆستای یاریدەدەر لە ١٩٨٠/١/١٧ لەزانکۆی سلێمانی/ کۆلیژی زانست دامەزراوە.

• لە ١٩٩٠/٦/٢٣ پلەی زانستی پرۆفیسۆری یاریدەدەری وەرگرتووە.

• لە ١٩٩٤/١/٣٠ بۆ جاری دووەم لەڕێگای هەڵبژاردنەوە کراوە بەڕاگری کۆلیژو تائێستا بەردەوامە.

• لەساڵی ١٩٨٣ بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی پاشانشینی بەریتانی.

• تائێستا سەرپەرشتی هەشت ماستەرنامەی کردووەوئێستاش بەردەوامە لەسەرپەرشتی قوتابییەکی ماجستێرو یەکێتی تری دکتۆرا کەبەم زوانە نامەکانیان ئامادە دەبێت.

• لەگەڵێك کۆنگرەی جیهانی بەشداری کردووە لەوانە :

_ کۆنگرەی جیهانی بۆ کیمیای شیکردنەوە لەشاری ئەدنبرەی بەریتانی لەساڵی ١٩٨٣.

_ کۆنگرەی جیهانی بۆ بابەتی Flow Analysis واتە (شیکردنەوەی بەردەوام) لەشاری (برمنگهام)ی بەریتانی ساڵی ١٩٨٥.

_ کۆنگرەی جیهانی بۆ پاکژکردنەوەی ئاو لەشاری لیدز ساڵی ١٩٨٤.

_ کۆنگرەی بەریتانیا بۆ کیمیای شیکردنەوە لەشاری شفیلدی بەریتانی لەساڵی ١٩٨٤.

• تائێستا زیاتر لەپانزە لێکۆڵینەوەی زانستی لەبوارە جیاجیاکانی زانستی کیمیای شیکردنەوە بەرێبازی ئۆتۆماتیکی پێشکەش بەگۆڤارە جیهانییەکان کردووەو بڵاوکراونەتەوە، ئەمانەی خوارەوە ناوی هەندێکیانە :_

_ Evaluation of a mixed Ag2/Ag1 membrane as Hg(11) electrode.
گۆڤاری Analytical Lewers ی ئەمریکی ساڵی ١٩٨١.

_ Simultaneous determination of iron (111) and iron (11) by flow injection analysis and spectrophotometric detection.

گۆڤاری Anal.Chim. Acta ی بەریتانی ساڵی ١٩٨٥.

_ Determination of Anions by flow injection method.
گۆڤاری Anal.Chim. Actaی بەریتانی ساڵی ١٩٨٦.

_ Determination of oxonium ion in strongly ionisable inorganic acids.
گۆڤاری Analyst ی بەریتانی ساڵی ١٩٩٠.
_ براءة اختراع Patent .

دروست کردنی ئامێری ئەلکترۆنی ئۆتۆماتیکی بۆ خەملاندنی ئایۆنی هایدرۆنیۆم بەهۆی تیشکی کیمیایی. ژمارەی جیهانی داهێنانەکە GOID GOIN27/62 5/26 ژمارەی عیراقی 20 .

• دەیان نووسین و بڵاوکراوەی بەزمانی کوردی هەیە وەك :

– بۆچی پێویستیمان بەزانستە ؟.

– زانیاری یە کیمیایی یەکان لەژیانی ئەمرۆماندا.

– توخمە کیمیایی یەکان هاورێیانی هەمیشەیی مرۆڤ.

– پیس بوونی ئاو.

• ئەم دوو کتابەی خوارەوەی بەچاپ گەیاندوە بۆ خوێندنی زانکۆ :

– (تحصيل الحقن الجرياني المستمر) ساڵی ١٩٨٩ بۆ قۆناخی ماجستێر.

– کیمیای عەمەلی بۆ قۆناخی چوارەم بەشی کیمیا ساڵی ١٩٩٠ داینأوە.

تێبینی : لەم ژمارەیەوە بەباشمان زانی کەژیاننامەی زانستی و کارگێڕیی پسپۆرانی بواری زانکۆ وەکو خۆی و بێ پێشەکی بۆ نووسین بڵاوبکەینەوە.

پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. شێرزاد احمد النجار

# گفتوگۆیەکی زەینیی هێمن لەکەش و هەوایەکی هەڵچوودا

ر_ هەرێمی کوردستان

**دەمێکە بە نیازی ئەوەبین دیمانەیەك لەگەڵ پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتور شێرزاد احمد النجار جێگری سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر و سەرۆکی بەشی سیاسەت لە کۆلیژی یاساو رامیاری بکەین بەلام دیارە لەبەر سەرقاڵی ی دکتۆری بەڕێزو کەمی کات ئەمەمان بۆ مەیسەر نەبوو تاوەکو لەم رۆژانەی دواییدا پشووی نیوەی ساڵمان بەهەل زانی و بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیمان پێوەی کردو ئەم دیمانەیەمان لەگەڵ سازدا:**

## • داهاتووی مرۆڤایەتی.

**هەرێمی کوردستان: ئێمە لە کۆتایی سەدەی بیستەم داینە ئایا چ تەسەوورێك لە گۆڕێ دا هەیە بەرامبەر داهاتووی مرۆڤایەتی؟**

**وەلام:** کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەبەردەوامی لە ئاشتی نەژیاوە بەڵکو ملململانێی یەکی بەردەوامی بەخۆوە دیوە لەبەینی لایەنێکی ئیصلاحی شۆرشگێری ی گۆڕانکاری ی خواز لەگەڵ لایەنێکی تر کەدەیویست ئەم بارودۆخەی هەیە بیچەسپێنن و بەردەوام بێ وە لەئەنجامی ئەم ململانێ یەدا زۆر بیروباوەری مرۆڤایەتی و نامرۆڤایەتی دەرچووەو مرۆڤیش زۆر ئازاری لەدەست ئەو بیروباوەڕانەدا دیوە کەدژی مرۆڤایەتی بوون هەروەها بەربەستێك بوون لەبەردەمی ئەو مرۆڤەدا کەببێتە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و بەیەکسانی لەگەڵ بوونەوەرەکانی تر بژێت. لەبەرئەوە تێبینی دەکرێ تاکاتی ئێستاش دەنگی ئەو مرۆڤەی کەداوای دادو یەکسانی و ئازادی دەکرد زۆرجار نەیانهێشتووە ئەو دەنگە بەرز بێتەوە ولیان لێ کردووە کەسیستەمێکی کۆیلایەتی لەسەر ئەو مرۆڤە بچەسپێ. بەلام مرۆڤ

کۆڵ نەدا لەکاتێکدا کەخاوەن بیرو فەیلەسوفان پێشڕەوێتی یان کرد. ئەوەبوو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بیروباوەڕی نوێیان لەو بارەیەوە بلاوکردەوە بیروباوەڕی ڕزگارکردنی مرۆڤ لەهەموو ئەو کۆت و زنجیرەی کەڕێگا لەبەردەم پێشکەوتنی دەگرێ. وە هەتا لەسەردەمی ئێستامان کەسەدەی بیستەمە کەمرۆڤ پێویستی بەڕزگار بوونە لەو زوڵم و زۆرداری و چەوسانەوەی کەلەڕابردوو پێی یەوە دەناڵی بەڵام ئەم هەوڵانەش جارێکی تر زیندەبەچاڵ کران بەفعلی بیروباوەڕی هەمەلایەنی ی تۆتیالیتاری و دەست بەسەراگرتن لەو بیروباوەڕانە بیروباوەڕی فاشی لەپێشەوەی ئەو بیروباوەڕانە بوو.

لەکۆتایی سەدەی بیستەم ئەم ململانێ یە ئیدیۆلۆژیایەی کەلەنێوان بیروباوەڕی سۆسیالیستی و سەرمایەداریدا هەبوو سست بوو بەهۆی ڕوخانی سیستەمێک کەدەیویست سۆسیالیستی بچەسپێ وە ئەو سیستەمە کەنەیتوانی بەرامبەر بیروباوەڕی دیموکراتی لیبرالی ڕابووەستێ بەهۆی چەسپاندنی بنەمایەکی ڕاستەقینەی سۆسیالیستی یەت بەشێوەیەکی چەوت.

لەئەنجامدا بۆ جیهان وا بەدیارکەوت کەدیموکراسی ی لیبرالی دەبێتە تاقە سیستەمێک و ئەو سیستەمە لەململانێ لەگەڵ هەر بیروباوەڕێکی تر ڕزگاری دەبێت بەڵام لەڕاستیدا ئەوەش ڕاست نەبوو چونکە بەڕای هەندێ خاوەن بیرەکان بەتایبەتی بەڕای خاوەن بیری ئەمریکی بەناوبانگ Huntington هنتگتن کەتیۆری یەکی نوێ ی هێنایەکایەوە کەدەڵێ:

ئەو ململانێ یە ستراتیژی یەی کەهەبوو لەسەدەی بیست و یەکدا دەگۆڕێ بۆ ململانێ لەمابەینی شارستانیەتەکاندا Clash of Civilizations کەلەلێکۆڵینەوەیەکی زۆر گرینگ لەگۆڤارێکی بەناوبانگ لەهاوینی ساڵی ١٩٩٣ بڵاوی کردۆتەوە.

ئەو تیۆری یە دەڵێ ئێستا لەجیهاندا حەفت هەشت شارستانی یەت هەیە و ئەو ململانێ یە لەمابەینی ئەو شارستانی یەتیانەدا دەست پێ دەکات کەئەمانەن:

شارستانی یەتی ڕۆژئاوایی ـ مەسیحی.

ئیسلامی ـ عەرەبی.

کۆنفوشیوسی یە
بوزی
هندۆسی
یابانی
ئەمەریکای لاتینی
هەروەها ئەفەریقی

ئەو ململانێ یە لەو شوێنانە دەست پێ دەکات کەناوچەی بەیەك گەیشتنە وە ئەو جۆرە بیروباوەڕە پێچەوانەی ئەو بیروباوەڕە ئەمەریکایی یە بوو کەدەیووت دوای کۆتایی هاتنی ململانێ ی ئیدیولۆجی سیستمێکی جیهانی نوێ New World Order بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا دادەمەزرێ. وەئێستاکە ئەگەر تەماشای کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بکەین دەتوانین بڵێین تاچ رادەیەك ئەو پرۆژە ئەمریکیە سەرکەوتوو بووە.

دەگەڕێینەوە بۆ ململانێ ی شارستانی یەتەکان، ئەوەی دەتوانین بڵێین ئەوە یەکێك لەبیروباوەڕەکان بوو کەدەیانەوێ شێوەی دوارۆژی مرۆڤ دیاربکەن بەڵام تیۆری یەکەی تر تیۆری ی پرۆفیسۆر فوکویاما Fokoyama یە کەدەڵێ کەململانێ ی ئیدیۆلۆژی تەواو بوو ئەوا مێژووش کۆتایی پێ دێ.

ئێمەش دەڵێین کۆمەڵگای نێودەوڵەتی چ کۆتایی پێ دێ بەو شێوەیەی کەدیارکراوە وە چ پێویستە لەنێو ململانێ شارستانی یە بژیێن بەڵکو دەتوانین بڵێین راستە شارستانی یەتی جۆراوجۆر هەیە وە راستە کۆمەڵەی رۆشنبیری ی جیاواز هەیە بەڵام مانای ئەوە نی یە کەئەم ناکۆکیانەی هەیە مان بدرێن و بگەیەندرێنە باری ململانێ بەڵکو بەپێچەوانەوە دەڵێین مرۆڤایەتی زۆر پێویستی هەیە کەسوود لەتاقی کردنەوەکانی خۆی وەربگرێ و

دەکرێ تەسەور بکەین کەبەبێ ئەوە ژیانی شارستانی یەت لەمابەینی ئەو شارستانیەتانە پێویستی بێ لەجیاتی ئەوەی ململانێ یەکی شارستانیەت هەبێ.

## • دیموکراسی یەت و مافی مرۆڤ.

**هەرێمی کوردستان:** بەلای تۆوە دیموکراسی یەت و مافی مرۆڤ چی دەگەیەنێ؟

وەڵام: مرۆڤ کە پێ دەنێتە ژیان هەندێک مافی سروشتی هەیە لەو مافانە مافی ژیانە کە چووە ناو کۆمەڵ ئەو مافی ژیانەی نابێتە مافێکی ژیانی رەها بەڵکو دەبێتە مافی ژیانێکی رێژەیی بەوەی کە ئەو مافی ژیانە زۆر مافی تری لێ جیادەبێتەوە وەکو مافە کۆمەڵایەتی یەکان، مافە ئابووری یەکان...هتد. وە لەبەرئەوەی مرۆڤ ئەندامێکە لەکۆمەڵدا بۆیە ئەو مافانە پڕۆسە دەکات و سوودیان لێ وەردەگرێ وە بۆ ئەم مەسەلەیەش لێک دانەوەی جۆراو جۆر هەبووە یەکێک لەو لێک دانەوانە دەتوانین پێ ی بڵێین «لێکدانەوەی دیموکراسی بۆ مافی ژیان» کەواتە دیموکراسی یەت فەلسەفەیەکە پەیوەندی یەکی پتەوی هەیە لەگەڵ مرۆڤ بۆ ژیان لێرەدا دەتوانین بڵێین پەیوەندی یەکی زۆر بەهێز لەمابەینی هەردووکیان هەیە وە لەبەرئەوە ئەگەر تەماشای سەرچاوەکانی دیموکراسی یەت بکەین دەبینین کەدیموکراسی یەت داوای دادو یەکسانی دەکات. مانای وایە داوای دادو یەکسانی بۆ مرۆڤ دەکات مانای ئەوەیە ژیانی مرۆڤ لەلایەن مەبدەئی دادو یەکسانی یەوە دەبێ قیادە بکرێ.

## • پێویستە زانکۆ لەلێکۆڵینەوەو بەرنامەی خۆی پێشرەو بێت بۆ گۆڕانکاری •

**هەرێمی کوردستان: تاچەند لە زانکۆی سەلاحەدین ڕازین... دەتوانن لە ڕووی بەرنامەو کادیری وانە وتنەوەوە هەڵی بسەنگێنن؟ وە ئایا دەکرێ لەگەڵ زانکۆکانی دەرەوەی وڵات بەراوردی بکەین؟**

وەڵام: پێشکەوتنی کۆمەڵ وای لە مرۆڤ کرد کە پێویستی بە دەزگایەکی زۆر بەنرخ ببێ، دەزگایەک کە بەئەرکی زانست و پێشکەوتن و پەرەپێدان لەناو کۆمەڵ هەڵبستێ وە ئەو دەزگایە پێ ی دەووترێ زانکۆ. کەوابوو زانکۆ بۆ «ڕابواردنێکی فیکری» (ترف فکری) نەهاتووە بەڵکو بلەەزراندنی ئەو دەزگایە بەدەنگەوەهاتنێکی پێویستی ی کۆمەڵ بوو. لەو

خاڵەشەوە پێویستە بچینەسەر شی کردنەوەی بارودۆخی زانکۆی سەلاحەدین و دەشپرسین تاچ ڕادەیەك زانکۆی سەلاحەدین ئەو دەنگدانەوەیە بووە. ئەگەر زانکۆی سەلاحەدین بیەوێ ببێتە دەنگ دانەوەیەك بۆ پێویستی یەکانی کۆمەڵگای ئێمە لەسەری پێویستە لەو پێویستی یانە بکۆڵێتەوەو چارەسەریشیان بۆ دابنێ بەڵام ئەگەر بەراووردێکی ئەو لێکۆڵینەوانە بکەین کەلەزانکۆ کراوە ،وەچەندیش ئەو لێکۆڵینەوانە کەمە، تەماشا دەکەین زۆربەیان تیشك دانەوەی ئەو واقیعە ناکەن کەواتە لێرەدا دەتوانین بڵێین زانکۆ ،چەندیش بارودۆخەکەی ناسك بووە وەزۆریش زەحمەت بووە، نەیتوانیوە بەتەواوی بەم مەسەلەیە هەڵسێ و چارەی بکات وە ئەو ئەرکە زۆربەی دەکەوێتە سەرشانی مامۆستایانی زانکۆ وە نازانم ئایا ئەوە ئەنجامی کارتێکردنی ،جادەیە لەسەر زانکۆ یان نا؟ چونکە بەڕاستی زانکۆ ئەو دەزگایەیە کەپێویستە لەسەری کاریکاتە سەر جادە واتە کۆمەڵ نەك بەپێچەوانەی ئەوە بێت. وە ئەگەر تەماشای پێشکەوتنی زانکۆکانی تر بکەین زۆر بەڕوونی دەبینین زانکۆکانی دەرەوە پێشڕەو بوون لەو گۆڕانکاری یانەی لەو کۆمەڵگایانەدا روویان داوە. وە نزیکترین نموونە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٦٨ لەفەرەنساو ئەڵمانیایە کەخاوەن بیرەکانی زانکۆ پێشڕەو بوون لەو داواکاریانەی کەدەیانووسیت ئەو کۆمەڵگایانە بەتەواوی ئیسلاح بکەن و بیانگۆڕن بەناوبانگترینی ئەو خاوەن

بەرامبەر قاوەخانەی (هالیلکا) بەوە بەناوبانگە کەقاوەخانەی روناکبیران و ڕۆشنبیرانە هەروەها ئیمپراتۆری نەمسا فرانس جوزیف لێ ی دادەنیشت.

---

بیرانە مارکوزە Marcuse و هابرماز Habermas بوو.

کەواتە پێویستە زانکۆ لەلێکۆڵینەوەو بەرنامەی خۆی پێشڕەو بێت بۆ گۆڕانکاری وەهەر زانکۆیەك لەجێ ی خۆی ڕاوەستاو نەیتوانی لەو بوارە خزمەتێك یان دەورێك پیشان بدات سروشتەکەی دەگۆڕێ وەلەجیاتی ئەوەی ببێتە زانکۆکەیەکی ڕاستەقینە دەبێتە قوتابخانەیەك بەس. جا نازانم ئایا مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین




حەز دەکەن بەڕاستی زانکۆی سەلاحەدین سروشتەکەی ,وای لێ بێتن یان نا؟

مادام زانکۆی سەلاحەدین ئەو گیروگرفتەی هەیە، ئایا دەکرێ لەگەڵ زانکۆکانی تر بەراوورد بکرێ؟!

بەلای ئێمەوە زۆر زەحمەتە ئەم بەراووردە چونکە باروئۆخی ئەو زانکۆیانە وەکو زانکۆی ئێمە نی یە. هەروەها زانکۆیەکی وەکو زانکۆی سەلاحەدین کەتەمەنی بیست و نۆ ساڵە ئایا دەکرێ لەگەڵ زانکۆکانی وەك فیەنە کەتەمەنی ٤٥٠ ساڵە بەراووورد بکرێ من دەڵێم نا بەلام مانع نی یە مرۆڤ سوودیان لێ ببینێ وەسوود لەبەرنامەو ڕێك وپێکی ی زانستی ی ئەوان وەربگرێ. بۆ نموونە زانکۆی فیەنا نزیکەی دوو سەد هەزار قوتابی کەناوی خۆیان تیای تۆمار کردووە لەو هەموانە لە ١٪ تا ٥٪ دەتوانن خوێندن لەکاتی خۆی تەواو بکەن وە ٥٠٪ لەو ژمارەیە دووقاتی ئەو ماوەیان پێویستە بۆ تەواو کردنی

خوێندن بەڵام لەزانکۆی ئێمە نەك بەتەنیا لەزانکۆی سەلاحەدین قوتابی کەهاتە زانکۆ حساب دەکات کەدوای چوار ساڵی تر دەردەچێ. پرسیار دەکەم دەڵێم بۆچی قوتابی بیری وادەکاتەوە، ئایا بەرنامەکە وا ئاسانە؟ ئایا زانستەکە رێك وپێك نی یە؟ ئایا قوتابی یەکان زیرەکن؟ بۆیە زانستەکە زۆر بەتەواوی و بەدیقەت وەردەگرن بۆیە لەکاتی خۆی دەردەچن؟.

لەراستیدا، ئەرکی رێك وپێکی زانستی و ئەرکی مەنهەجی یەتی زانستی تەنیا بەسەرۆکایەتی زانکۆ تەواو نابێ بەڵکو ئەو ئەرکە لەسەرشانی مامۆستای زانکۆیە پێویستە ئەو رۆڵە ببینن چونکە مامۆستای زانکۆ لەکردارەکانی پەروەردەیی زانکۆ ئەو بنەرەتە.

وەلێرەدا تەئکید لەسەر کارلێکردنی کۆلیژەکانی زانکۆ دەکەم کەپێویستە لەجیاتی ناوبری دانان لەمابەینیان هاوکاری و پەیوەندی پتەوی یەکتری بکەن وە لێرەدا دەمەوێ نموونەیەك بۆ ئەم مەبەستە بهێنمەوەو حوکمەکەی بۆ ئێوەی بەرێز بەجێ دەهێڵم. نزیکەی ساڵێکە ناوبڕێکی دەسکرد لەنێوان کۆلیژی ئەندازەو کۆلیژی یاساو رامیاری دامەزراوەو کەتەماشای ئەم دیاردەیە دەکەم لەخۆم دەپرسم ئایا دەکرێ ئەقڵێکی وەها بتوانێ بەزانیاری و فیکری پێشکەوتن خواز کۆلیژ یان زانکۆ ئیدارە بکات؟!

## • یاساو سیاسەت.

**هەرێمی کوردستان: پەیوەندی نێوان یاساو سیاسەت چۆن دەبینن؟**

وەڵام: سیاسەت و یاسا پەیوەندی یەکی مێژوویی زۆر دەمێرین هەیە. ئەو پەیوەندی یە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کۆمەڵگای سیاسی دامەزراوە بەدامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی رەوشت و هەڵس وکەوتی کۆمەڵایەتی رێکخراو لەقاڵبێکی کلاسیکی تەقلیدی کەلەلایەن داب و نەریتەوە رێك دەخرا دەرچوو و خرایە چوارچێوەیەکی تر کەبریتی یە لە چوارچێوەی یاسایی بۆیە بۆ هەموو جۆرە پەیوەندی یەك لەناو کۆمەڵ بنچینەی یاسایی داندرا وەرێزلێگرتنی هاولاتیان لەچوارچێوەیەکی

ئەقلبدی دەرچوو کەبرینی. بوو لەریز لەکەسایەتی گرتن وەبەرەوریزگرتن لەیاساو دەزگاکان رۆیشت ئەو دەورەی درایە یاسا ئەوەبوو لەلایەن سیاسەتەوە پێ ی درا وەسیاسەتیش هەر ئیشێکە کەئامانجی سوودێك یان بەرژەوەندی یەکی گشتی بێت.

وە بەدڵنیابی یەوە سیاسەت یاسا ئاراستە دەکاتن چونکە بنچینەی یاسایی تەعبیر لەوویستی دەوڵەت دەکاتن وەوویستی دەوڵەت وویستی ئەو کەسانەیە کەدەسەلاتیان هەیەو بنچینەی ئەو بنچینانە بنچینەی دەستوورە.

**هەرێمی کوردستان: زۆرجار گوێمان لێ بووە دەڵێن دکتۆر شێرزاد قوتابخانەیە دەتوانن پێمان بڵێن ئەو بەرنامەیەی لەو قوتابخانەیە دەخوێندرێ ناوی چی یە؟**

وەلام: لەراستیدا حەزم نەدەکرد وەلامی ئەم پرسیارە بدەمەوە چونکە ئەم پرسیارە هەندێك لایەنی هەڵسەنگاندنی تیایە کە من نامەوێ خۆم لەچوارچێوەی ئەو هەڵسەنگاندنەدا ببینم بەلام دەڵێم من قوتابیەکی زۆر بچوکم لەقوتابخانەیەك کە رەگ و ریشەی مێژوویی خۆی سەرەتای سەرهەڵدانی بیری مرۆڤایەتی لەشارستانیەتی میسوپۆتامیاو ئەفلاتوون، ئەرستۆ تۆلیس دەبینن وە بەتایبەتی ئەکادیمیای بەرێوەیی بەکاز (اكاديمية المشائيين) وە خۆی لەقوتابخانەی ئەو پیاوە گەورانەدا دەبینێتەوە کە خزمەتی مرۆڤایەتیان کردووە خزمەتێك کە بەجدیەت و خۆنەویستی لەپێناوی یەك ئاکە مەبەست کە ئەویش پێشکەوتنی کۆمەڵە. نموونەی ئەم کەڵە پیاوانە زۆرن وەك لوك و روسۆو کانت و هیگڵ و لەزانایانی موسڵمانیش ئیمام غەزالی و ئیبین روشدو فارابی هەروەها مارکس و سارتەر...هتد.

ئەوەی شایەنی باسە هەر یەکێك لەو گەورە پیاوانە تەماشا کردنێکی جیاوازیان بۆ ژیان هەبووە بەلام خاڵێکی هاوبەش بەیەکتری دەبەستنەوە ئەویش ئەوەبوو کە چۆن خزمەتی مرۆڤایەتی بکەن بەگوێرەی فیکری

خۆیان، من دەڵێم پێویستە جدیەت و دیقەت و بیرکردنەوەی مەنتقی و بەرنامەیەکی روون و ئاشکرا لای هەر مرۆڤێك هەبێ کە چووە ناو ئەو قوتابخانەیە. ئەو دیقەتە (دقة) دەگاتە ئەو حاڵەتەی کە کانتزمێری شارەوانی لەسەر دەرچوونی فەیلەسووفی گەورە کانت لەماڵی خۆی دادەنرا، هەروەها ئەو دیقەتەش لەوێ دیار دەبێت کە بتهوڤن سەرەڕای تووش بوونی بەنەخۆشی ی کەڕی بەڵام ئەم کەڕێتی یە نەبووە هۆی ڕێگاگرتن لێ ی لەتەواو کردنی سەمفۆنیای نۆیەمی کە دوا سەمفۆنیای بوو کە بەدقەت تەواوی بکات. ئەوە بوو ئاگای لەوە نەبوو کە جەماوەر چەند چەپڵەیان بۆی لێ دەدا هەتا یەکێك لە ئەندامانی تیپەکە ئیشارەتی بۆی کردو پێ ی ووت سەیرکە جەماوەر چیت بۆ دەکا.

## • خوێندن لەپێش فانۆس و لامپا.

**هەرێمی کوردستان: ئێستا بەچی خەریکن و چیتان بەدەستەوەیە؟**

**وەلام:** خەریکی دووەمی ئیشم یەکێك لەوانە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر قوڵە بۆ کۆنگرەی زانستی ی زانکۆ ئامادەی دەکەم کە نیازوایە لەمانگی حوزەیرانی ئەم ساڵ ببەستری. ئەو لێکۆڵینەوەیەش بەناوی «النظرية النقدية للديمقراطية»یە جگە لەمەش خەریکی خوێندنەوەی هەندێك کتێبم لەبواری پسپۆرێتی ی خۆم وەلێرەدا شێوازی من وایە کە چاوناپڕمە تەنیا کتێبێك بۆیە لەهەمان کاتدا بەکتێبێك زیاتر خەریك دەبم وە ئەو کتێبانەی کە ئێستا لەبەر دەستم دایە ئەمانەن:

١ــ Thomas Macarthy, kritik der verstandiguns verhaltnisse, 1989 (توماس مکارتي، نقد التفاهم الإتصالي). دراسەتێکە دەربارەی فەیلەسوفی هاوچەرخی ئەڵمانی Habermas .

٢ــ Jurgen habermas, Faktizitat urd Geltung, 1994 (يورغن هابرمان، الحقائق والتطبيقات) دراسەتێکە دەربارەی دەوڵەتی یاسایی دیموکراسی ی.

٣- A.J.R. Groon and M.Light, contemporary International Relations: A Guide to Theory, 1994. (گروم ولايت، العلاقات الدولية المعاصرة، دليل نحو النظرية.

لێرەدا حەز دەکەم بڵێم ئەو ئەرکە زانستی یە زۆر زەحمەتە چونکە خوێندنەکەم لەپێش فانوس و لامپایە نەك وەکو هەندێکیان لەپێش رووناکی کارەبا وەلێرەدا حەز دەکەم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە کاتی خۆی لەبەرپرسی کارەبای یەکەم د.ادریس هادی صالح وە هەروەها بریکاری ئەو داوام کرد وەك مامۆستایانی تر کە زیاتر لەسێ ساڵ بەبەردەوامی ئەو کارەبایەیان هەیە ئەگەر بتوانن یارمەتیەك لەو بوارە پیشان بداتن چونکە زیاتر لە سێ سەد حاڵەتی استثنائی بۆ مەسەلەی کارەبا لەناو هەولێر هەبووە بەڵام زۆر بەداخەوە وەڵامێکی وام درایەوە کە ناتوانم لەرۆژنامەدا باسی بکەم بەڵام سەرەرای ئەو زەحمەتی یە لەکاروانی زانست و فیکردا کەمتەرخەمی ناکەین و ئەرکی خۆشمان ئابتوانین بەتەواوی لەبۆ زانکۆ و کۆمەڵ پێشکەش دەکەین.